



چیرۆکێکی شانۆگەرییە

حبیب محمد سعید




چیرۆکێکی شانۆگەرییە

حبیب محمد سعید

چاپخانەی ( الارشاد ) لە بەغدا
ساڵی ١٤٠٦ی کۆچیی

# پێشەکیی

**الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه أجمعين ...**

سروشتی ئیسلام هەر وایە .. هەمیشە پیاوی بە غیرەتی پەروەردە کردووە ، تا خاك و ئاوی ئیسلام بە خوێنی گەشیان بپارێزن و دژی داگیرکەران و دەستدرێژیکەرانی بێگانە بووەستن ، یا تا دژی ئەوانە بووەستن کە بە دەم و بە رواڵەت شوێنکەوتەی ئیسلامن و بە کردەوە لە کافران خراپتر دژی ئیسلام و موسڵمانەکانن ؟ تا نەهێڵن دەست بخەنە خوێنی موسڵمانەکانەوە ..

جا کە ئیسلام ئایینێکی وەها رزگاریخواز بێت ، ئەبێت هەمیشە گەنجی خوێنگەرم بخاتە مەیدانەوە تا شەرەف و کەرامەتی موسڵمانان بپارێزن ..

سەعیدی کوڕی جوبەیر کێیە ؟

پێشەوایەکە لـە پێشەوا تابعیەکان[1] • ئەوە بوو ئەگەر یەکێ لـە دانیشتوانی کووفە لە بارەی شتێکەوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ـ خوا لێی رازیی بێت ـ ، کە بـە « حبر الأمة » ناسرا بوو ، پرسیاری بکردایە ، ئەیفەرموو : « ئێوە سەعیدی کوڕی جوبەیرتان لایـە و پرسیار لـە من ئەکەن ؟ » •

وە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لـە بارەیەوە ئـەفـەرموێ : « سـەعیدی کوڕی جوبەیر کوژرا و هەرچی وا لـە سەر زەویا داماوە بۆ زانیاریەکەی » •

سەعیدیش ـ بـە وێنەی شارەزاکانی تری ئـەو سـەردەمە ـ نـاڕەزا بوو لـە رەفتی حەججاج بەرامبەر بـە خەڵـکیی و لـە خۆبەگەورەگرتنی بـە نـاڕەوا و زێـر چەپۆك خستنی موسڵمانەکان و خوێن رێژانی و

---

(١) تابعیی : بەو موسڵمانە ئەوترێ کە زانیاریی لـە دەمی هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە وەر گرتبێ ••

ریند،بەچاڵ کـردنی سەربەستیەکان وە دەستدرێژ کردنی بۆ ماف و ناموسی خەڵکیی .

بۆیە دەر بەوەی سەرکردەی پاڵەوان و لێزان عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەشعەثی قەیسیی بانگی شۆڕشی دژی حەججاج و نەوەی ئومەییە هەڵ دا و بە سەربازەکانیەوە بەرەو عیراق کشا ، خێرا زۆرێك لە زانایان و ئاینداران پاڵیان پێوە دا ، لە پێش هەموویانەوە سەعیدی کوڕی جوبەیر و عامیری شەعبیی و موطریفی کوڕی عەبدوڵڵا .

جەنگ لە نێوان سەربازەکانی کوڕی ئەشعەث و سەربازەکانی حەججاجدا دەستی پێ کرد ، لە سەرەتاوە لەشکری موسڵمانە شۆڕشگێڕەکان سەرکەوت ، بەڵام لە کۆتایدا حەججاج بە فڕوفێڵ و زۆر و ستەم و ئارامیەوە ، توانیی زاڵ بێ و کوڕی ئەشعەث لە جەنگی « دیر الجماجم » دا تێك بشکێنێ ، تا ئەوە بوو کوڕی ئەشعەث هەڵات و پشتیوانەکانیشی

تـا لێیان شەهید کران و تـا لێیان بـە دیل گیران وە تـا لێیان هەڵاتن ٠٠

سەعیدی کوڕی جوبەیریش یەکێك بوو لەوانەی کە هەڵات و خۆی شاردەوە ٠٠ جا ئەبوایـە بـە پێی فەرمایشتی ئیسلام واز بهێنرێت لەو هەڵاتوو و شکاوانە، کەوا هەڵاتوویان راو نەنرێت و دیلیـان نەکوژرێت و هەڵمەت نەبرێتە سەر زامداریان و نـەکوژرێن ، بـەڵام حەججاج ئـەم فەرمانەی ئیسلامی خستە ئـەو لاوە و زۆرێ لـە دیلەکانی کوشت و هەڵاتووەکانی گرت و هێنانی دای لـە ملیان ٠ بەم شێوەیەش فەرمانی گرتنی سەعیدی دەر کرد تـا دوای پتر لـە دە سـاڵ دەستی کەوت و لەگەڵ ئەم هەموو ماوەیـەدا [ کـە مەترسیی شۆڕشەکەشیان نەما بوو ] چاوپۆشیی لێ نەکرد و ئەوە رووی دا کە رووی دا ٠

بـەم شـێوەیە سـەعیدی کـوڕی جوبـەیر بووە نموونەیەکی زانا موسڵمانە تێکۆشەرەکان و بانگ‌کەرە

راستگۆکانی مێژووی ئیسلامیی ، ئەوانەی کە فەرمایشتی خوا رائەگەیەنن ، وە لە کەس ناترسن جگە لە خوای گەورە وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە باسیان ئەکات :

ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ الأحزاب

# بەشی یەکەم

## ( لەیەك دیمەن پێك هاتووە )

**کات :** چەرخی ئومەوییەکانە لە سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕواندا وە لە سەردەمی والیێتیی حەججاج بە سەر عیراقەوە ٠

**شوێن :** شاری واسیط لە باشووری عێراقدا کەوا حەججاج لە نێوان کووفە و بەسرەدا نەخشەی کێشا بوو ٠

**ئەندامان :** حەججاج بە شانازیی و لە خۆباییبوونێکەوە لە پێشی پێشەوەی ئەنجومەنی فەرمانەییدا ، دانیشتووە و چوار کەس لە دەست و پێوەندەکانی و چەند پاسەوانێکی چەکدار لە دەوریان ٠

**یەکێك لە دەست و پێوەند :** گەورەم پیرۆزبایی ئەو سەرکەوتنەت لێ ئەکەین کە بە دەستت هێنا بە سەر دوژمنانی گەورەی موسڵمانەکان و دوژمنانی خۆتدا ٠

**دووەم :** بە راستیی ٠ هەموو دانیشتوانی عیراق لە

بارەی ئەو پشت گیریە خوایەوە بۆ خەلیفە و شکانی عەبدورڕەحمانی کوڕی ئەشعەثی ئاژاوەچیی و پشتیوانە سەرشۆڕەکانیەوە ئەدوێن ، کە بە دەستی تۆ هاتە دیی ...

**سێیەم** : چاوپۆشیی فەرماندە و نەرم و نیانیی و بەزەیی هاتنەوەی بە میللەتا ئەو چاوچنۆکانەی لە خۆ بایی کرد ، تا مەترسیی لە بەرا لا بردن و هەڵسان بە شۆڕش و یاخیبوونی چەکدار ، بەڵام زۆر چاك زانییان کەوا ئەوان کێن و حەججاجیش کێیە .

**حەججاج** : ( بە خۆهەڵکێشان و لەخۆباییبوونێکەوە ) کوڕی ئەشعەث وا هات بە بیریا بە پشتگیریی کردنی زانایانی ئایینیی وێنەی سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەتوانێ جەنگ بەرێتەوە و سەر کەوێ .. بەڵام ئەوە خەیاڵی خاوە ، بە راستیی شیری حەججاج ناشکێت ، وە سەربازانی ئەوەی سەرەوان نابەزێن وە هەواڵی راستەقینە وا لە « دیر الجماجم » .

**چوارەم** : کەورەم ئەوانەی ئامادەی جەنگی دیر الجماجم

بوو بوون بۆیان باس کردم کەوا شمشێرەکانت چیان ئەکرد بە کوڕی ئەشعەث و شوێنکەوتووەکانی ، وە چۆن سەریان لە لەشیان جیا ئەبۆوە و پارچە پارچە ئەبوون . جا کاتێ شکان بووە بەشیان ناچار هەندێ خۆیان دا بە دەستەوە و ئەوانی تریشیان هەڵاتن .

**حەججاج :** ئەوانە پەندیان لەوە وەر نەگرت کە بە دەستی حەججاج هات بە سەر کوڕی زوبەیر و وێنەیا .. تا وایان بە سەر هات کە ئەیبینین !!

جا با درێغیی نەکەن تا نەتوانن ئاگری ناژاوە هەڵگیرسێنن ، من بۆیان ئامادەم .. من بۆیان ئامادەم !!

**سێیەم :** ( جارێکی تر ) بەڵام گەورەم نەکەیت بەزەییت بێتەوە بەو دیلانەدا کە بە ناچاریی خۆیان داوە بە دەستەوە و دڵ و دەروونیان پیشی خواردۆتەوە لە قار و قین بەرامبەر بە تۆ و بە نەوەی ئومەییە وە ئەو زانا ئاینیانەت لە بیر نەچێ کە نەك تەنها بە وتە بەڵکو بە شەڕەشیریش پشتگیریی کوڕی ئەشعەثیان کردووە بە تایبەتیی ئەو مامۆستایەی کە پێی ئەڵێن :

سەعیدی کوڕی جوبەیر •

**حەججاج :** ئێمە چاوەڕێی نامەی گەورەی موسڵمانەکانین لــە بارەیانــەوە ، لەوانەیە ئەمڕۆ بگات •

**یەکەم :** ئەورەی موسڵمانەکان لە بارەیانەوە فەرمان بە هیچ نادا جگە بــە شمشێر ، لــە سزای ئەو تاوانەدا کە پێی هەڵسان••وە هەرکەس نیری یاخێتی هەڵکێشابێ، پێی ئەکوژرێتەوە •

**دووەم :** راســت ئەکــەی دەســت پێ کەری خــراپە ، ستەمکارترە ••

**دەرگەوان :** پۆستەی گەورەی موسڵمانەکان گەیشت ••

**حەججاج :** ئەوە ئەوەیە کە ئێمە چاوەڕوانیمان ئەکرد • نامەکەم بۆ بێنە ! ( حەججاج نامەکە هەڵ ئەپچڕێ و بە دەنگێکی بیستراو ئەیخوێنێتەوە ) « سـەلام لــە تۆ و لەوانەی وان لەگەڵتا ، بەڵام لە دوایدا • هەرکەسێ هاوبــەشیی کردووە لــە ئاژاوەی کوڕی ئەشعەثدا لە جەنگی دیر الجماجم شمشێر بەرامبەری بگرە ، جا

هەرکامیان دانی نا بە کافریتیی خۆیا بەم یاخیی‌بونەی لێمان وازی لێ بێنە وە هەر کەسێکیش وای نەکرد و خۆی بە موسلمان ئەژمارد لە ملی بدە • و السلام ••

**حەججاج :** ( بە دەرگەوان ) سەرۆکی پۆلیس بانگ کە •
( دەرگەوان ئەچێتە دەرەوە و بانگی ئەکات ئەویش دێتە ژوورەوە ) •

**سەرۆکی پۆلیس :** گەورەم فەرمانتان بە چیە ؟

**حەججاج :** برو بۆ بەندیخانە و نامەی خەلیفە عەبدولمەلیك بۆ ئەو تاوانبارانە بخوێنەرەوە و ئەوسا بیانهێنەرە ئێرە •

**سەرۆکی پۆلیس :** گەورەم بە بیستن و گوێڕایەلییەوە •
( ئەچێتە دەرەوە و دوای تۆزێك دەرگەوان دێتە ژوورەوە ) •

**دەرگەوان :** پیاوێکی ریش‌سپیی لە دەرگا وەستاوە و ئەڵێ : پێویستیی بە فەرماندە هەیە •••

**حەججاج :** بیگێڕنەوە •• ئەمرۆ رۆژی پێویستیی و داواکارانی پێویستیی نیە •

**دەرگەوان :** پۆلیس لێیان دا و ویستیان بیگێڕنە دواوە ،

کەچی دەستی کردە گریان و هاواری کرد و وتی : یا نەبێ بمکوژن وە یا ئەمکەنە ژوورەوە لای فەرماندە ، لەگەڵ ئەمەشا پیاوێکی ریش‌سپی پشت‌چەماوەیە •

**حەججاج :** کەواتە با بێتە ژوورەوە •

( پیاوێکی پیری ریش‌سپیی سەر و سیمادار دێتە ژوورەوە ) •

**پیاوە پیرەکە :** ئەی فەرماندە سەلامت لێ بێ •

**حەججاج :** سەلامیش لە تۆ بێ • پێویستییت چیە ؟

**پیاوە پیرەکە :** ساڵێکە وە یا زیاتر کوڕەکەمتان گرتووە ، نە ئەوەتە بەری ئەدەن ، وە نە لێتان پرسیوەتەوە ، وە بە راستیی دایکێکی پیری هەیە کەوا لە بەر ئەو فرمێسکی وشك نابێتەوە ، وە خوشکێکی بێوەژنی هەیە کە دایکی سێ هەتیوە ، وە ئەمیش ناکە بەخێوکەری ئەم خێزانە هەموویەتی ، وە دوای خوا چاوەڕوانی دەستی ئەوین •

**حەججاج :** ( بە بێ وەستان ) لە سەر چیی گرتوومانە ؟

**پیاوە پیرەکە** : ( بە توندییەوە ) سەیرە ! ئایا خەڵکیی بەند ئەکەن و نازانن بۆ چیتان بەند کردووە ؟!!

**حەجاج** : ( بە نەرمییەوە ) مامەی ریش سپیی ، بەندکراوان زۆرن وە هەریەکەیان خراپە و تاوانێکی هەیە •

**پیاوە پیرەکە** : ئەم کوڕەی من بە هیچ جۆرێک هەڵنەساوە ، هەرچیی لە گۆڕێدایە ئەوەیە کاربەدەستەکەت یەکێک لە پیاوانی هۆزەکەمانی تاوانبار کردبوو ، جا کە هەوڵی گرتنی دا و ئەوی دەست نەکەوت ، لە جیاتیا کوڕەکەی منی گرت ••

**حەجاج** : ئەمە روو ئەدات • جاری وا هەیە نەخۆش لەش ساغ تووش ئەکات • جا ئەگەر ئەتەوێ کوڕەکەت بەر بدرێ برۆ پیاوە قاچاخەکە بێنە ، بۆچ نەت بیستووە کە بوێژ ئەڵێ :

ولرب مأخوذ بذنب عشيرة
ونجا المقارف صاحب الذنب

واتە : لەوانەیە لە تاوانی هۆزدا یەکێك بگیرێ و ئەوەش تاوانەکەی کردبێ رزگاری ببێ ؟!

**پیاوه پیرەکە** : ( بە توندییەوە ) بەلام من لە خوای گەورەم بیستووە کە جۆرێکی تری فەرمووە •
**حەججاج** : چیی فەرمووە ؟
**پیاوه پیرەکە** : خوای گەورە بە زمانی یووسفەوە دەری بڕیوە کەوا ئەو کەسە سزا بدرێت کە تاوانبارە ، وەك ئەفەرموێ :

قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّظَٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾ یوسف

جا ئایا ئەبێ ئێمە باوەڕ بە فەرمایشتی خوای گەورە بکەین یا بە وتەی بۆیز ••
**حەججاج** : بەزاندمت مامەی ریش‌سپیی •• وە بیانووت بڕیم •• بڕۆن کوڕەکەی بەر بدەن •
یەکێك لە دەست و پێوەند : لەم دادپەروەرییە !! خوا فەرماندەی دادپەروەر بژیەنێت •

**دووەم** : فەرماندەمان لە قورئان لا نادات •
**یەکێکی تر** : فەرماندە ئەتۆمێك ستەم ناکات • ( پیاوە پیرەکە ئەچێتە دەرەوە •• دوای تۆزێك دەرگەوان دێتە ژوورەوە ) •

**دەرگەوان** : ئـەوەتا سـەرۆکی پۆلیس بـە خـۆی و تاوانبارەکانەوە ئامادەیە .

**حەججاج** : با یەك لە دوای یەك بێنە ژوورەوە . ( پیاوێك دێتـە ژوورەوە لـە سـوارچاك و پاڵـەوان ئـەچـێ ، حەججاجیش بـە تووڕەیی و تینەوە سەیری ئەکات ) .

**حەججاج** : تۆش دیسـان ؟! لـە هـەموو ئاژاوەیـەکا ئەتبینین و بەرچاومان ئەکەویت ، تـا دوێنێ بوو لەگەڵ کوڕی زوبەیردا بووی و ئـەمڕۆش لـەگەڵ کـوڕی ئەشعەثدا ، وە ئەگەر ئاژاوەیەك لەوپەڕی جیهانەوە سەر هـەڵ بـدا تۆ یەکێکی لـە بانگکەرانی ، چیت دەسـت کـەوت ئـەی مونافیقی لـەخـۆبایی بوو ، بێجگـە لـە سەرشۆڕیی و شوورەیی تێشکان ؟!

**پیاوەکە** : ( بـە دامەزراوییەوە ) بـە خوا خاوەنی ڕەوا هەرگیز سەرشۆڕ نابێ ئەگەرچی هەموو جیهان دوژمنی بێت ، وە خاوەنی ناڕەواش هـەرگیـز پـایـەدار نابـێ ئەگەرچی لـە نێو چاوانیدا مانگ بدرەوشێتەوە !

**حەججاج** : ( بـە هـەڕەشەوە ) خـوا بمکوژێ ئەکـەر

ەت کوژم !

**پیاوەکە** : بـەڵام کاربەدەستەکەت بـە پێی بەڵێن و ، پەیمانی خوا ، بەڵێنی نەکوشتنی داومەتێ •

**حەججاج** : جا ئایا تۆ پەیمانی خوات پاراستووە ، تـا ئێمە پەیمانت بپارێزین ؟

**پیاوەکە** : هـەروا ـ ئـەی حەججاج ـ ناپاکییم لەگـەڵا نەکەیت و پەیمانی خوا ـ دوای بەستنی ـ ئەشکێنینەوە ؟

**حەججاج** : ( خۆی لـە وەڵامەکەی لا ئەدات ) هـەواڵم بـدەرێ : ئـەمجارە چیی باڵـی پێـوە نـای وا لێمـان هەڵگەڕایتەوە ؟

**پیاوەکە** : ( بە هێز و باوەڕەوە ) ئەوەی لەوە و پێش باڵی پێوە نام و ئەوەی لەمـە و دواش باڵم پێوە ئـەنێ • ئێـوە ئـەتانەوێ [ حوکم ] پاشایەتییەکی گـەزن بێ و ئێمـەش ئـەمانەوێ خیلافەت و شـوورا بێت •• ئێـوە ئەتـانەوێ کیسـرەویی و قەیسـەریی بێت و ئێمـەش ئەمانەوێ قورئانیی و ئیسلامیی بێت •

**حەججاج :** ( بە گاڵتەوە ) ئێمە لە ئیسلاما سەرمان سپی کردووە ، گوایا تۆ ئەتەوێ پێشمانمان بدەیت ؟

**پیاوەکە :** گوایە کەس هەیە نەزانێ خوێنڕشتن و دەست بەسەراگرتنی ماڵ و سامان و ترس خستنە دڵی موسڵمانەکانەوە خراپەیەکی وەها گەورەیە کە ئیسلام ڕێگای نادا ؟

**حەججاج :** ئەوە خراپکارانی - بغاة - وەك تۆ ئەمێ ئەکەین •

**پیاوەکە :** جا با بڵێین خراپکاریش بووم ، ئایا تۆ بەو شێوەیە لەگەڵما جووڵابتەوە کە یاسای خوا لەگەڵ خراپکارانا ئەجووڵێتەوە ؟ چونکە خرابکاران وازهاوردوویان لە جەنگ راو نانرێت ، و دیلیان ناکوژرێت ، و هێرش نابرێتە سەر زامداریان وە ماڵ و سامانیان دەستی بە سەرا ناگیرێت ••

**حەججاج :** بەڵام ئێوە تەنها خراپکار نین ، بەڵکو ئێوە پەیمانتان شکاندۆتەوە و لە ئەمیری موسڵمانەکان هەڵگەڕاونەتەوە •

**پیاوەکە :** ئێمە دوای ئەوەی ئارامەمان نەما دژی ستەم و لەسنوور دەرچوون هەڵساوین ، وە کوڕی ئەشعەث خۆی بە تەنیا هەڵ نەساوە بەڵکو هەموو دانیشتوانی عیراقی لەگەڵایە بە پێشەوایەتیی زانایانی عێراق ، جا ئایا ئەو هەموو زانایانە کافر و موونافیقن ؟ وە تۆ و سەربازەکانت ـ ئەی حەججاج ـ موسڵمان و ئیماندار و تۆبەکار و خواناسن ؟

**حەججاج :** ( دوای ئەوەی قسەی برا بە توورەییەکەوە ) ئاڵتەم پێ ئەگەی ناپاك؟ شەرت بێ بت گەیەنم بە پێشەوای سەرلێشێواو و ئاژاوەچیت ، کوڕی ئەشعەث . بیبەن و بدەن لە ملی .. ( ئینجا بە فیزێکەوە ئاوڕی دایەوە بۆ لای پیاوەکە و وتی ) با بزانین کاممان کوژراوی سەرشۆڕ ئەبین ؟ من یان تۆ ؟!

**پیاوەکە :** من وای لێك ئەدەمەوە بە کوشتن نامری ئەی حەججاج .

**حەججاج :** جا بۆچ ئەی هەواڵزانی دواڕۆژ ؟

**پیاوەکە :** چونکە من بە دەم پیاوچاکانەوە ـ وێنەی

حەسەنی بەصریی و سەعیدی کوڕی جوبەیر ـ بیستوومە کەوا لـە خوا پاڕاونەتەوە تـا بـە کوشتن نەتمرێنێ ، وە بـە سەر جێگاوە نەبێت نەمریت •

**حەججاج :** ( بە دڵ خۆشییەوە ) حەسەن و سەعید لە خوا ئەپاڕێنەوە بـە سەر جێگای خۆمەوە بمرم !؟

**پیاوەکە :** بەڵێ ئـەی حەججاج ، تا سزاکەت هەمووی هەڵگرێت بۆ ئەو جیهان کە ئەوە توندتر و داوەشێن ترە •

**حەججاج :** ( بە هەڵچوونەوە ) ئـەم نەفرینلێکراوە بکوژن ، بیـەن بۆ جەللاد •

**یەکێ لە دەست و پێوەندەکانی :** هەر شایانی ئەوەیە •

**یەکێکیتر :** بۆ وێنەی ئەو هێشتا ئەمە کەمە •

**سێیەم** « وجزاء سیئة سیئة مثلها » • پاداشتی هەر خراپەیەك خراپەیەکە بە وێنەی خۆی •

( لە نێوان تاوانبارکراوەکانا ریش سپییەك لە ئەوەی ئەمیم و گەنجێ لە ئەوەی بیکر دێنە ژوورەوە ) •

**حەججاج :** ( بە گەنجەکە ) ئایا تۆ موسڵمانی یا کافری

ەی بیکریی ؟

**گەنجەکە** : ئەتەوێ کافر بم یان موسڵمان ؟

**حەججاج** : ( بە توندییەوە ) ماوەی دەمە دەمێ نیە ، کافری یا موسڵمان ؟

**گەنجەکە** : کافرم •

**حەججاج** : ( بە تەشەرەوە ) بەڵام پیری تەمیمیی بە کافرێتیی خۆی رازیی نابێت •

**پیرەکە** : ئەتەرێ بمخەڵەتێنی ئەی حەججاج ؟ بە خوا شتێکی گەورەتر بوایە لە کافرێتیی پێی رازیی ئەبووم ، بە مەرجێ لە شیری تۆ رزگارم بێ •

( جاحەججاج پێکەنی و فەرمانی دا ریگای بدەن بڕوا • ئینجا پیاوێکی تر دێننە بەر دەمی ) •

**حەججاج** : تۆ لە سەر ئایینی کێیت ؟!

**پیاوەکە** : لە سەر ئایینی ئیبراهیم بە پاك و خاوێنیی ، وە ئەو لەوانە نەبووە کە هاوەڵ بۆ خوا دا ئەنێن •

**حەججاج** : بەن لە ملی ئەم درۆزنە •

( ئینجا پیاوێکی تر دێننە ژوورەوە ) •

**حەججاج** : تۆ لە سەر ئایینی کێیت ؟

**پیاوەکە** : وام لە سەر ئایینی شێخ یووسفی باوکت •

**حەججاج** : بەلێ ، بە خوا پیاوێکی رۆژووگر و شەونوێژی کەر بوو • کوڕە وازی لێ بێنە با بڕوا •

( خزمەتکارەکە کۆتەکانی کابرا ئەکاتەوە و ئەویش بۆ دەر بڕینی ئەو راستییەی کەوا لە دلیا پەنگی خواردۆتەوە ، لە حەججاج نزیك ئەبێتەوە و ئێرانە پێی ئەلێ )

**پیاوەکە** : ئەی حەججاج ، لە هاوەلەکەمت پرسیی : تۆ لە سەر ئاینی کێیت ؟ ئەویش وتی : وام لە سەر ئایینی ئیبراهیم بە پاك و خاوێنیی ، کەچی تۆ فەرمانت دا بە کوشتنی ، وە هەمان پرسیاریشت لە من پرسیی و منیش وتم : وام لە سەر ئایینی شێخ یووسفی باوکت ، جا وتت : بەلێ بە خوا پیاوێکی رۆژووگر و شەونوێژی کەر بوو و فەرمانت دا بە بەردانم •

**حەججاج :** ( سەری ئەلەرێنێتەوە ) بەڵێ .. بەڵێ .

**پیاوەکە :** بە خوا ئەی حەججاج ، سا ئەگەر باوکت هیچ تاوان و خراپەیەکی نەبێ جگە لەمەی کە کوڕێکی وەك تۆی خستۆتەوە ، ئەمەندەی بەسە تا بە خراپ و تاوانکار بدرێتە قەڵەم .

(دەست و پێوەندەکانی بە سەرسوڕمان و تێکچوون و پلتوبۆڵەوە سەیری یەکتری ئەکەن ) .

**حەججاج :** ( بە تووڕەیی و هەڵچوونەوە ) بیکوژن .. ئەم نەفرین لێکراوە ناپاکە بکوژن .. بەن لە ملی .

( ئینجا گەنجێکی ناوچاو پاك کە ناوی ثابت ئەبێت دێتە ژوورەوە ) .

**یەکێك لە دەست و پێوەند :** ( بە چپەوە ئەدات بە گوێی حەجاجدا ) ئەمە لە قوتابیەکانی سەعیدی کوڕی جوبەیرە !!

**حەججاج :** تۆ لە قوتابییەکانی مامۆستای گومڕای گومڕاکەر سەعیدی کوڕی جوبەیری ؟

**ثابت :** نە .

**حەججاج :** ئەتەوێ پەیوەندییت پێیەوە بشاریتەوە ؟

**ثابت :** ئەو مامۆستایەی ناوت برد من نای‌ناسم ، بەڵکو من مامۆستای پیاوچاکی چاکویستی زانای تێکۆشەر سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەناسم •

**حەججاج :** ئەی نەفامی مونافیق ، یەکێ لە خەلافەت هەڵ گەڕێتەوە و هەوڵی بەرپاکردنی ئاژاوە بدا ، پیاو چاکی چاکویستە ؟!

**ثابت :** هەرکەس لە ئایینی خوا لای دا رەوایە بۆ موسڵمانان لێی هەڵ گەڕێنەوە • وە ئاژاوە تەنک‌هەلچنینی زانایان و پیاوچاکان و ئازاردانیانە بە ناڕەوا •

ئایا ئەی حەججاج فەرمایشتی خوای گەورەت نەخوێندۆتەوە کە هەڕەشە ئەکات لەوانەی ئازاری موسڵمانان ئەدەن و هەوڵیان لەگەلا ئەدەن تا لە ئایین وەریان گێڕنەوە ، کە ئەفەرموێ :

إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٠﴾ البروج

**حەججاج :** ئەمە زانیاریی سەعیدی کوڕی جوبەیرە ؟

**ثابت :** بەڵکو ئەمە فەرمایشتی خوا و فەرمایشتی پێغەمبەرەکەیەتی •

**حەججاج :** بەو خوایەی تۆ سوێندی پێ ئەخۆی ئەبێ یەك لە دوای یەك درۆینەتان بکەم هەتا تاقتان لێ ببڕمەوە •

**قوتابییەکە :** تۆ درۆینە ئەکەیت و خواش سەوز ئەکات جا سەیر کە توانای بەدیهێنراو بە پێی توانای بەدیهێنەر چەندە ؟

**حەججاج :** ئەم خۆبەزانانەزانە بکوژن ( ئینجا ئاوڕ ئەداتەوە بۆ لای و بە گاڵتەوە ئەڵێ : ) تۆ بڵێی مامۆستا پیاوچاکە چاکویستەکەت ئەمڕۆ بگاتە فریات ؟!

**ثابت :** قازانج و زیان بە دەستی خوایە ! « ألا لە الخلق والأمر ) وە بۆ ئەم رۆژە خۆمان ئامادە کردووە••• جا وا تۆ بوویتە کڕیار ئەی حەججاج !

**حەججاج :** چ کڕیارییەك ئەی نەفامی خۆ بە زانا زان •

**ثابت :** أعوذ بالله من الشیطان الرجیم

إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ

... (١١١) التوبة

خوا سەر و ماڵی ئیمانداره‌کانی کڕیوه به بەهەشت • وه ئەمه ڕۆژی پێشکەش کردنی شت و مەکەکانه ، جا با ئێمەیش نرخەکەی وەر گرین که بەهەشته ئەی حەججاج •

... وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ ... (١١١) التوبة

جا کێ له خوا زیاتر وەفای به پەیمان و بەڵێنی خۆی هەیه ؟!

**حەججاج :** جگه له ئاگر لەوێ هیچ نابینی • ( به دەست و پێوەندەکانی ) خێرا بیبەن • بەن له ملی ••

**ثابت :**

فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِى هَـٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ (٧٢) طـه

جا چ فەرمانێك دەر ئەکەی دەری که • تەنها لەم جیهانەدا دەستت ئەڕوا و ئەتوانی فەرمان دەر کەیت •

( ثابت ئەبەن بۆ کوشتن )

**حەججاج :** کێ ماوە لەو چاتۆلبازانە ؟؟

**سەرۆکی پۆلیس :** عامیری شەعبیی و موطریفی کوڕی عەبدوللا ماوون • بەلام سەعیدی کوڕی جوبەیر رای کردووە و خۆی هەشار داوە وەکو ئەزانی ••

**حەجاج :** ئایا نەتان توانی بە وزد و درشتتانەوە شوێن کوڕی جوبەیر بکەون و بیگرن ؟

**سەرۆکی پۆلیس :** خوا پشتیوانی فەرماندە بێت ، وڵاتی ئیسلام فراوانە و لە توانای هەموو ئادەمیزادێکا هەیە کەوا را بکا و چەند رۆژێ - کەم بێ یا زۆر - خۆی بشارێتەوە • بەلام هەر ئەبێ شوێن خۆشاردنەوەکەی بدۆزرێتەوە و بە زووترین کات وە دەس بهێنرێت •

**حەججاج :** ئەو دوانە هەردوکیان لە بەندیخانەدا بهێڵنەوە هەتا سێهەممان دەست ئەکەوێ وە هەرگیز کوڕی جوبەیر لە چنگم رزگاری نابێت • من حەججاجم !! من کوڕی یووسفم !!

( پەردە )

# بەشی دووەم

## دیمەنی یەکەم

**( سەعیدی کوری جوبەیر لە مەککە و لە مانی یەکێك لە قوتابییەکانیدا خۆی شاردۆتەوە ، وە قوتابییەکانی بە دەوریا کۆڕیان بەستووە ) ٠**

**سەعید :** بسم الله الرحمن الرحيم ٠ سوپاس و ستایش بۆ خوا ئەکەین ، وە درووود و سەلامیش پێشکەش ئەکەین بە گیانی پاکی پێغەمبەری خوا و کەس و کاری و ئەوانەی شوێن رێگای راست کەوتوون ٠٠

موعاذی کوڕی جەبەل ـ خوا لێی رازیی بێت ـ لە پێغەمبەری خواوە ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی : هیچ بەندەیەك لە رۆژی قیامەتا ناتوانێ پێ بجوولێنێ هەتا لە چوار شت پرسیاری لێ نەکرێ : لە تەمەنی لە چیا تەواوی کردووە ؟ لە گەنجێتیی لە چیا بەختی

کردووە و لە پێناوی چیا خۆی تووشی بەڵاو نارەحەتیی کردووە ؟ وە لە ماڵ و سامانی چۆنی پەیدا کردووە ؟ و. لە چیا بەختی کردووە ؟ وە لە زانست و زانیاریی چ کردەوەیەکی پێ کردووە ؟

ئەم فەرمایشتە ، ئەی رۆلەکانم ، بارێکی گـــران ئەخاتە سەرشانی هەڵگرانی زانیاریی ، وە خوای گەورە ئەو رۆژ لە بارەی ئەو زانیاریەوە پرسیاریان لێ ئەکات کەوا چیان پێ کردووە هـەروەکو پرسیار ئەکات لە هەموو کەسێ لە بارەی ئەو بەخششانەوە کە پێی بەخشیوە چی پێ کردوون ؟ بەخششی ژیان ، بەخششی گەنجێتیی و ، .. بەخششـی سامان وە لە دوایـیدا بەخششی زانیاریی کەوا خوا بە هۆیەوە ئادەمیزادی لە گیانلەبەرانی تر جیا کردۆتەوە .. زانیاریی ـ رۆڵەکانم ـ بەخششێکی گەورەیە خوای گەورە ئەیبەخشێ بە هەر کام لە بەندەکانی کە خۆی بیەوێ وە سـوپاسـی ئـەم بەخششەش ئەوەیە ئیشی پێ بکرێ و پیشانی خەڵکی تر بدرێت ، جا هەر کەس زانیاریی هـەبوو و ئیشی بـەو

زانیارییەی کرد ، ئا ئەوە زانای خواناسە ( العالِم الربانيّ ) ـ وە هەر کەس زانیارییەکی زانی و لەوانەی شاردەوە کە پێویستیان پێیەتی ، لە ڕۆژی قیامەتا لغاوێکی ئاگرین ئەکرێتە دەمی وە هەرکەس زانیارییەکی زانیی و ئیشی پێ نەکرد ئەوە وەکو گوێ درێژێك وایە کەوا بار بکرێت لە پەڕاو و کتێب .. وە لە بەر ئەمە بوو لە هەموو شتێ زیاتر پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە دوای خۆی ترسی لە زانای مونافیق ئەبوو کەوا ببێتە کۆسپ لە ڕێگای ئوممەتەکەیدا ..

**یەکێکیان** : ( بە سەرسوڕمانەوە ) زانای مونافیق ؟!
چۆن مرۆڤ لە یەك کاتا زاناش ئەبێت و مونافیقیش ؟

**سەعید** : بە زمان زانا و بە دل خالیی لە ترسی خوای گەورە . لە عەلیی کوڕی ئەبوطالیبەوە ئەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی :

« من نە لە موسڵمان و نە لە کافر ناترسم زیانتان پێ بگەیەنێ ، چونکە موسڵمان ئیمانەکەی ڕێگای

خراپەی نادا ، وە کافریش بێبڕوایی خۆی لـە نـاڕی نەبـا • بەڵام ترسم لەو مونافیقەیە کە بە دەم زانایـە و ەوەی ئێوە بە چاکی ئەزانن ئەیڵێت و ئـەوەی ئێوە بـە خراپی ئەزانن ئەیکات •• ئا ئەوەیە ـ کوڕەکانم ـ زانای مونافیق کە مێشکی پڕە لـە زانیاری و دڵی خاڵییە لـە ترسی خـوا •

**قوتابییەك :** ناونیشانی لەخواترسان کامەیە ؟

**سەعید :** ناونیشانی لـە خواترسان ئـەوەیە خـۆت بپارێزی لـە سەرکەشیی و لـە خوا یاخیبوون •

**قوتابییەك :** ئەی ئەوە چییە کە مرۆڤ ئەخاتە سـەر رێی لـە خواترسان ؟

**سەعید :** ئەوە یادی مردن و ڕۆژی دواییە کەوا ژەنگی دڵان لا ئەبات و بایی بوونی ئادەمیزاد بە ژیانەوە کـەم ئەکاتەوە • وە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ دوو ئـامۆژگـاریی کـەری بۆ بـە جـێ هێشـتووین : دەنگدارێك و بێدەنگێك • جـا دەنگدارەکە قورئانە و بـێ دەنگـەکەش مردنە ، وە ئـەم دووانـە بەسـن

ئامۆژگاریی کەری موسڵمانان بن !! وە من ئەگەر ساتێ مردنم لە بیر بچێتەوە ئەترسم کە دڵم لە ڕێی ڕاست لا بدات .

**قوتابییەك** : ئایا ئەبێ لەمەوە وا تێ بگەین کەوا موسڵمان بە بێ نرخ سەیری ژیان ئەکات وە یا حەزی لێ ناکا ؟!

**سەعید** : نا ، کوڕەکەم ، هەموو ڕۆژێ کە بە سەر موسڵمانا ئەڕوا ئەبێ بە دەسکەوتی بزانێ کەوا لەو ڕۆژەدا خوای خۆی ئەپەرستێ ، یا کەڵك بە خەڵکیی ئەگەیەنێ ، وە یا خۆی چاك ئەکا ، کەواتە ئەم جیهانە لە لای موسڵمان کێڵگەیەکە تۆوی چاکەی تیا ئەچێنێ بۆ ئەوەی سبەی ڕۆژ درووێنەی بکاتەوە ..

( ئینجا ڕوو ئەکاتە هەمووان )

کوڕەکانم ! ئەم جیهانە لە لای خوا کێشی باڵە مێشوولەیەکی نیە . وە ئەوەندە لە لای خوا بێ نرخە کەوا لێرەدا نەبێ کەس ناتوانێ لێی یاخیی بێ ، وە دوژمنەکانی تیایا را ئەبوێرن ، وە زۆر و ستەم لە

بەندەکانی ئەکەن وە پشتیوان و خۆشەویستەکانی تیایا ئازار ئەدرێن و دەربەدەر ئەکرێن • جا لە بیرتان بێت ئەم جیهانە کورتە جیهانی دوایتان لە بیر نەباتەوە • چونکە خوا ژیانی ئەم جیهانە بە خۆشەویستیش و بە دوژمنیشی ئەبەخشێ ، بەلام جیهانی دوایی تەنها بە خۆشەویستی خۆی ئەبەخشێ ، و ئایینیش بە بێ زانیاریی بێکەڵکە ، و زانیاریش بە بێ کردەوە بێکەڵکە ، وە کردەوەش بە بێ دڵسۆزیی بێکەڵکە • وە من داوا لە خوای خاوەن دەسەڵات ئەکەم کەوا دوای خۆم ئێوە بکاتە زەخیرە بۆم و خۆی یارمەتیی دەر و چاودێریی کەرتان بێت ، هەتا ئێوەش لەوانەبن کە زانیاریان هەیە و کردەوەی پێ ئەکەن ، وە کردەوە ئەکەن و بە دڵسۆزیی ئەی‌کەن ، وە دڵسۆزن و بە موسڵمان وەر ئەگیرێن •

قوتابییەکی تر : مامۆستا گیان ئەڵێی دوایین ئامۆژگاریمان ئەکەیت •

سەعید : ئەرێ بە خوا ، جا کێ ئەزانێ ! لەوانەیە

ئـەم بـەیەك گەیشتنەمان دوایی مـاوەی ژیانـم بێ لـە گەڵتانـا لەم جیهانە کۆتایی هاتووەدا !

**قوتابییەك :** خوا تەمەنی مامۆستا درێژ بکات و سوودی نـەبڕاوە کات •

**سەعید :** خۆیشتان ئەزانن ئەم پیاوە(١) خەریکە بـە جاسووس و سەربازەکانیەوە هـەموو کـون و قوژبنێك ئەگەڕێ بـە شوێنما تـا بمدۆزێتەوە • لایشم ئاشکرایە هەر ئەمدۆزێتەوە و هەرکەش بمدۆزێتەوە ئەمکوژێ •

**قوتابییەکان :** ( بە دڵگـەرمیی و خـەفەتەوە ) بـە خوێن و گیان و هەرچی شتێك بـەرین خۆمان ئەکەیـە قوربانت ••

**سەعید :** مردن کـۆتایی هـەموو زینـدووێکە ، وە هەرکەس بـە شمشێر نەمرێت بە شتێکی تر ئەمرێت •

وطعم الموت في أمـر حقير كطعم الموت في أمر عظيم

**واتـە :**

---

(١) حەججاج کوڕی یووسف •

مردن هەر مردنە ، سا مرۆڤ لە سەر شتێکی بەورە بمرێت یا لە سەر شتێکی بێ نرخ ..
وە هیچ نالێم جگە لەوەی کە پیاوچاکان وتویانە کە لە خوا پاڕاونەتەوە تا ئارامیان بە سەرا برژێنێ و بە موسلمانێتیی بیان مرێنێ :
رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ ﴿١٢٦﴾ الأعراف

وە هەواڵتان ئەدەمێ کەوا من و دوو هاوەڵم رۆژێکیان پێکەوە دانیشتبووین دەستمان کرد بە پاڕانەوە لە خوای گەورە . هەرسێکمان داوامان لێ کرد لە پێناوی ئاینەکەیا شەهیدیمان پێ ببەخشێ ، جا دوو هاوەڵەکەم خوا پاڕانەوەکەی گیرا کردن و شەهیدیان بە دەست هێنا ، بەڵام من هێشتا هەر چاوەڕوانیی ئەکەم، وە تکا ئەکەم لە خوای گەورە کە بە منیشی ببەخشێ .

**لوتابییەکی تر :** جا چۆن ئێمە بەرامبەر کاروکردەوەی ئەم ستەمکارە لە سنووردەرچووە بێدەنگ بین ؟

**سەعید :** کوڕم ! خوا کارێکی هەیە و ئەیەوێ جێ

بەجێی بکا ئەگینا ئێمەی کۆمەڵی زانایان و شارەزایان بە جارێکا دژی ئەم کابرایە هەڵساین و چووینە ریزی کوڕی ئەشعەثەوە بۆ جەنگان لە گەڵیا ، بەڕاوەکانمان بە جێ هێشت و کەتیبەی ئیمانمان ئامادە کرد و خواحافیزییمان لە پێنۆسەکان کرد و شمشێرمان کردە شان وە مەرەکەبی زانایانمان گۆڕییەوە بە خوێنی شەهیدان .. ئێمە شتێکمان ویست و خوایش شتێکی تر ، تا ئیمان و ئاوامان تاقی بکاتەوە . تا ئەوە بوو هەندێ بە کوژراویی و هەندێ بە دیل گیران و هەندێ بە را کردن شۆڕشەکەمان کوژایەوە .

**قوتابییەك** : ئایا هەڵگرانی راستیی تاوانبار ئەبن ئەگەر بێت و بە دەستی ستەمکارە ناڕەواکان شکێن ؟

**سەعید** : نە تاوان و نە گوناه ـ ئەگەر خوا بیەوێ ـ بەڵکو کاتێ گوناهە کەوا ئێمە رازیی بین بە خراپە . وە یا پشت گیریی لە ستەم بکەین ، بەڵام ئەگەر ئێمە هەوڵمان دا و کۆششمان کرد ئیتر ئەوە هەموو دەسەلاتێکی ئێمەیە ، و ئەنجام بە دەستی ئێمە نیە ، وە

خوای کەورە لێمان ناپرسێ : بۆچ سەر نەکەوتن ؟ بەلکو ایمان ئەپرسێ : بۆچ هەوڵتان نەدا ؟

**عومەیری فوتابیی** : بەلام ئایا ئەم شەوە زەنگە کۆتایی ـە ؟ ئایا راستیی ئەبێ هەر پاڵنەکاو بێت ؟ کەوا باڵەکەوەرەکانی بکوژرێن و شوێنکەوتوو و پشتیوانەکانی ئازار بدرێن ؟ کەچیی ناڕەوا سنگ دەر پەڕێنێ و ئاازاری بکا بە دەسەڵات و پایەیەوە و ، بە ئارەزووی خۆی دەست بخاتە خوێن و سامان و شەرەفی خەڵکییەوە کەسیش نەبێ بەرهەڵستیی بکا ؟! ئایا ئێمە لە سەر رەوا ـین و ئەو ستەمکارانە لە سەر ناڕەوا ؟!!

**سەعید** : دایکت رۆلەڕۆت بۆ بکا عومەیر . ئایا تۆ ئەمە ا کومانت هەیە ؟ بە خوا ئەگەر پارچە پارچەمان ـەن و باڵمە بمان فڕێنن و بینە خۆراکی دڕندان ..مانمان لەوەدا نیە کە ئێمە لە سەر رەواین و ئەوانیش لە سەر ناڕەوا .

**عومەیر** : ئەی بۆ ئەوان هەر سەر ئەکەون و سەر ئەکەون و ئێمەش هەر ئەشکێین و ئەشکێین ؟!

**سەعید** : ئێمە ئـەو رۆژە ئەشکێین کـەوا کومانمان لـەو ڕەوایەمان هەبێ کە بانگی بۆ ئەکەین ، وە یـا بەو ناڕەوایەی کـە ئەوان وان لـە سەری بخەڵەتێن • بـە راستیی هەڵگری رەوا هـەرچەندە بێدەسـەڵات بێ ، هەر سەر ئەکەوێ •• هەر سەرئەکەوێ • ئەگەرچی لە بـەر چاوی نزیکبینەکانـا بـە شـکاو دیار بێت ! ئایـا نموونەیەکتان بۆ بێنمەوە ؟! •

گـەورەترین نموونـە لـە مێژووماندا پێغەمبەری خوایە ـ صلى الله عليه وسلم ـ لە رۆژی کۆچ کردندا، ئـەو رۆژەی کە لە ماڵ و وڵاتەکەی دەر پەڕێنرا و بـە پەنامـەکیی خـۆی گەیاندە ئەشـکەوتـە تاریکەکـە و دوژمنانیش دەر و دەشتیان گرتبووە بەر تا بیگرن ، ئایـا ئێوە لەم هەڵویستەدا پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليـه وسلم ـ بە سەرکەوتوو ئەزانن یان بە شکاو ؟

( قوتابیەکان بێ دەنگ ئـەبن نازانـن چی وەڵام بدەنەوە ) •

**سەعید** : ئەوە چیتانە ، بۆ وەڵام نادەنەوە ؟

یەکێ لە قوتابییەکان : کام ئیمان دار ئەوێرێت پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ بە شکاو بژمێرێت ، دوای ئەوەی خوا بە سەرکەوتنی خۆی پشتیوانی کردووە ؟

سەعید : پێکاوتە و چاکیشی ، جا ئایا لەو رۆژەدا پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ سەرکەوتوو بوو ؟

( قوتابییەکە نێك ئەچێ ناتوانێ بە جوانیی وەڵامەکەی بداتەوە ) .

سەعید : بەڵام من ئەو رۆژە بە یەکێك لە رۆژەکانی سەرکەوتن و پایەبەرزیی ئیسلام ئەژمێرم .. چۆن وا نا کە خوا لە قورئانەکەیا وای بڕیار داوە ؟ لەگەڵما ئاوێ بگەرن بۆ ئەم وتارە خوایە کە چۆن باسی سەرکەوتنی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەکا لە رۆژی کۆچ کردندا :

إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا .... (٤٠) التوبة

کەواتە لەو رۆژەدا خوا سەری خستووە .. لەو رۆژەدا کـە لە گەڵ هاوەڵەکەیدا لە ئەشکەوتەکەدا گفتوگۆیـان ئەکرد ، جـا کێمان ئەوێرێ پێغەمبەری خوا ــ صلی الله علیه وسلم ــ لەو رۆژەدا بـە شکاو نـاو بەرێت لە کاتێکا خوا سەری خست .

ئەوەتا عومەری کوڕی خەططاب بە تێ لەیشـتی خۆی ئەم واتا گەورەیەی لـە رۆژی کۆچ کردندا هەست پێ کرد تـا ئەو رۆژەی کردە سەرەتای دەستپێ کردنی مێژووی ئیسـلام ، خۆ دیارە زیریی پەسـەندی ناکات مێژووی ئیسلام بە رۆژێ دەست پێ بکات کە ئیسـلام تیایا شکا بێ .

**عومەیر :** مامۆستا گیان ، داوای لێبووردنت لێ ئەکەم ، لــەوانـەیـە بـەم وتـەیـەم دڵـم یـەشـاند بـی ، بـەڵام ئەوەی وتـم لـە بەر ئەوە وتـم چونـکە ئادەمیزاد بـە پەلەکەر دروست کراوە ، جـا هەرچی جارێ ئەبینم بەڵا و تەنگاویی و ئازار تووشی موسڵمانە بانگ‌کەرەکان بۆ لای خوا ئـەبێ ، ئـارامم لا نامێنێ و

بەرچاوم تاریك ئەبێ بە تایبەتیی کە ئەبینم بانگکەرانی ناڕەوایی ، ئەوانەی کە خراپکاریی لە سەرزەوییدا بلاو ئەکەنەوە و هەوڵێ نادەن بۆ چاکە ، ئەبینم ئەوانە بە خۆشیی و رابواردن و لەشی ساغەوە ژیان ئەدەنە سەر وە وا زەوییش خۆی بۆ رازاندوونەتەوە و ئەوانیش وا ئەزانن بە هەتا هەتایی تیایا ئەمێننەوە •

**سەعید :** لە سەر خۆ ، کوڕە شیرینەکەم ، هەڵگرانی بانگی خوا پێویستە تەنگ و چەڵەمە و ئێش و ئازاریان بێتە رێ چونکە ئەوان شوێنکەوتەی رێبازی پێغەمبەرەکانن ، بۆ ئەوەی خوا تاقیان بکاتەوە و لە قووڵایی دڵیان تێ بگا و پاك و پیس لە یەك جیا بکاتەوە ، بەلام ئەو خۆشیی و رابواردنەی کە بە کۆمەڵی ناڕەوا دراوە ئەوە تەگبیری خوایە و بە ویستی خۆی جڵەوی کاروباریان بۆ ئاسان ئەکا تا بیانوویان ببڕێ و ئەم رابواردن و دەستڕۆیشتنە بکاتە بەڵگە بە سەریانەوە ، ئەوسا ـ کە کاتی خۆی هات ـ بە دەسەلات و توانای خۆی لە ناویان بەرێت • وەك لەو بارەوە کە باسی

کەواتە لەو رۆژەدا خوا سەری خستووە •• لەو رۆژەدا کـە لە گەڵ هاوەڵەکەیدا لە ئەشکەوتەکەدا گفتوگۆیـان ئەکرد ، جـا کێمان ئەوێرێ پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەو رۆژەدا بـە شکاو نـاو بەرێت لە کاتێکا خوا سەری خست •

ئەوەتا عومەری کوڕی خەططاب بە تێ گەیشـتنی خۆی ئەم واتا گەورەیەی لـە رۆژی کۆچ کردندا هەست پێ کرد تـا ئەو رۆژەی کردە سەرەتای دەستپێ کردنی مێژووی ئیسـلام ، خۆ دیارە زیرەکی پەسـەندی ناکات مێژووی ئیسلام بە رۆژێ دەست پێ بکات کە ئیسـلام تیایا شکا بێ •

**عومەیر :** مامۆستا گیان ، داوای لێبووردنت لێ ئەکەم ، لــەوانـەیـە بـەم وتـەیـەم دڵــم یـەشـانـد بـێ ، بـەڵام ئەوەی وتـم لـە بەر ئەوە وتـم چونـکە ئادەمیزاد بـە پەلەکەر دروست کراوە ، جـا هەرچی جارێ ئەبینم بەڵا و تەنگاویی و ئازار تووشی موسڵمانە بانگکەرەکان بۆ لای خوا ئـەبێ ، ئـارامم لا نامێنێ و

بەرچاوم تاریك ئەبێ بە تایبەتیی کە ئەبینم بانگکەرانی
ناڕەوایی ، ئەوانەی کە خراپکاریی لە سەرزەویدا بلاو
ئەکەنەوە و هەوڵێ نادەن بۆ چاکە ، ئەبینم ئەوانە بە
خۆشیی و رابواردن و لەشی ساغەوە ژیان ئەدەنە
سەر وە وا زەوییش خۆی بۆ رازاندوونەتەوە و ئەوانیش
وا ئەزانن بە هەتا هەتایی تیایا ئەمێننەوە •

سەعید : لە سەر خۆ ، کوڕە شیرینەکەم ، هەڵگرانی
بانگی خوا پێویستە تەنگ و چەڵەمە و ئێش و ئازاریان
بە رێ چونکە ئەوان شوێنکەوتەی رێبازی
پێغەمبەرەکانن ، بۆ ئەوەی خوا تاقیان بکاتەوە و لە
موولایی دڵیان تێ بگا و پاك و پیس لە یەك جیا بکاتەوە ،
بەلام ئەو خۆشیی و رابواردنەی کە بە کۆمەڵی ناڕەوا
دراوە ئەوە تەگبیری خوایە و بە ویستی خۆی جڵەوی
کاروباریان بۆ ئاسان ئەکا تا بیانوویان ببڕێ و ئەم
رابواردن و دەستڕۆیشننە بکاتە بەڵگە بە سەریانەوە ،
ئەوسا ــ کە کاتی خۆی هات ــ بە دەسەلات و توانای
خۆی لە ناویان بەرێت • وەك لەو بارەوە کە باسی

کۆمەڵێکیان ئەکات و پیشانی ئەدا چۆن ئەوانەی خوایان لە بیر نیە و لە رێبازەکەی لا ئەدەن ، بۆ ماوەیەك خوا لە هەموو لایەکەوە دەرگای خۆشیان لێ ئەکاتەوە • تا تەواو بە خۆیانا بنازن و وا بزانن ئەوە ئازایەتیی خۆیانە ، تا لە ناکاوا لە ناویان بەرێت و کۆتایی بێنێ بە کۆمەڵی ستەمکار ئەوەتا خوای گەورە لە سوورەتی ( الأنعام ) دا ئەفەرموێ :

فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ الأنعام

وە یاسای خوا وایە ـ ئەی کوڕی شیرینم ـ هەر رۆژە کۆمەڵێك دەستی بڕوا •• رۆژێ بە باری ئۆدایە و رۆژێ بە بارێکی ترا ، بەڵام سەرەنجام و کۆتایی گەیشتنە مەنزڵە و دیارە سەرەنجامیش هەر بۆ لەخواترسەکانە •

ئەی عومەیر ، ئایا نێ کەیشتی و دڵت حەسایەوە ، یاوەکو هێشتا دڵت شك و گومانی تیا ماوە ؟

جا کوڕەکەم ئەگەر وایە ، ئەوە پێویستییت بە خوێندنەوەی قورئان هەیە سەر لە نوێ بە مەرجێ مێشك و دڵتی بدەیتێ ، تا بزانی خوای گەورە هەندێك لە بەندەکانی بە هەندێکیان تاقی ئەکاتەوە ، تا لە ئەنجاما خاوەن بڕوا دڵسۆزەکان دەر کەون و شایانی سەرکەوتن بن ، وە دڵپیس و کردارپیسە بێبڕواکانیش دەر کەون و شایانی لەناوبردن بن ، ئایا پێشەوەی سوورەتی « العنكبوت » ت نەخوێندۆتەوە کە ئەفەرموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ العنكبوت

کەوا پێویستە هەموو ئیماندارێك تاقی بکرێتەوە و لە سەر ئاین تەنگ و چەڵەمەی بێتە ڕێ ، وە ئایا ئەم فەرمایشتەی خوات لە سوورەتی « الفرقان » دا نەخوێندۆتەوە کە ئەفەرموێ :

وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ؟.. (٢٠) الفرقان

کـه دەری ئەخا خوا هەندێکمان بـە هەندێکمان تاقـی ئەکاتەوە ئینجا ئەپرسێت : ئایا ئارام ئەگرن ؟ وە یا لـە سورەتی « محمد » دا ئەفەرموێ :

ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ....(٤)

وە هەر لەو سورەتەدا ئەفەرموێ :

وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ (٣١) محمد

ئەمەش بەڵێنی خوایە بۆ موسڵمانەکان ئەوانەی کە خۆیان بە بەندەی خوا ئەزانن خوا ئەفەرموێ: من تاقیتان ئەکەمەوە بە بەڵا و لێقەومان و تەنگاویی ، تا بزانم کامتان لـە پێناوی منا هەوڵ و کۆشش ئەکەن و لە سەری ئارام ئەگرن .

وە بـە خوا هەرچی هاوەڵم هەیە وا یەکە یەکـە

تووشی تاقی کردنـەوەی خـوا دێن جگە لـە من کـە بـە بێوەی مازمەتەزە ، بـە شێوەیەك خۆمم لـە بـەر چاو کەزتزوە ، وە وا ئەزانم خوا پێویستیی بـە من نیە، تـا بەڵا و تاقیکردنەوەم دێت بە سەرا ، ئەوسا هیوا پەیدا ئەکەمەوە بەشکوم بگەم بـە هاوەڵەکانم ، وە تـا لـەو بەخشندانەی کە دەستی بانگکەرانی ئیسلام ئەکەوێن منیش شتێکم دەست کەوێ •

**عوبەیر :** خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە ، بە خوا وات لێ کردم ئێستە پێم خۆشە تاقی کردنەوە و بەڵام برژێ بـە سەرا •

**سەعید :** ئیماندار داوای بێوەیی ئەکا لە خوا ، وە ئاواتی بەڵا و تاقیکردنەوە ناخوازێ ، بەڵام ئەگەر هاتە رێی بـە وێنەی پاڵەوانان ئارام ئەگرێ ••

( لـە ناکاو پۆلیسێك دێتە ژوورەوە و پرسیاریان لـێ ئەکات ) •

**پۆلیسەکە :** کەس لە شوێنی خۆی نەجووڵێت زانیومە کەوا سەعیدی کوڕی جوبەیر لێرەیە لـە ناوتانا ، جـا کامتـان ئـەوە ؟

**قوتابییەکان :** ( هەموویان بە یەك دەنگ ) منم !

**پۆلیسەکە :** سەیرە ! هەمووتان سەعیدی کوڕی جوبەیرن ؟

**قوتابییەکان :** بەڵێ ، هەموومان سەعیدی کوڕی جوبەیرین •

**پۆلیسەکە :** سەعیدی کوڕی جوبەیر یەکێکە یان دە ؟ سەعید یەکێکە لە ئێوە پێشانم بدەن و لە کورتییا بیبڕنەوە ، ئەگینا لای والیی شکاتی هەمووتان ئەکەم و هەمووتان پێکەوە سزا ئەدرێن •

**یەکێکیان :** من سەعیدی کوڕی جوبەیرم •

**یەکێکیتر :** باوەڕی پێ مەکە من سەعیدم •

**سێیەم :** باوەڕیان پێ مەکە بە خوا من سەعیدم •

**پۆلیسەکە :** سوێن ئەخۆی تۆ سەعید بی ؟

**سەعید :** کوڕەکەم ! باوەڕیان پێ مەکە من سەعیدم ، وە ئەوانە قوتابییەکانمن ، ئایا دێت بە بیرتا سەعیدی کوڕی جوبەیر گەنج بێت ؟! سەعید تەمەنی وا لە پەنجا

و حەوت سالیدا و ئەمانە هەموویان ـ وەکو ئەبینی ـ گەنجن ، جا چۆن باوەڕ ئەکەی ئەوان هیچیان سەعیدی کوڕی جوبەیر بن ؟!

**پۆلیسەکە** : ئەمە راستە • من چۆن ئەمەم لێ تێک چوو ؟! ( ئینجا ئاوڕ ئەداتەوە بۆ لای ئەوەیان کە سوێندی خوارد کە ئەو سەعیدە ) •

**پۆلیسەکە** : تۆ چۆن سوێن بە خوا ئەخۆی کە تۆ سەعیدی ؟ تۆ قوتابیی زانیاریت و سوێنیش بە درۆ ئەخۆی ؟!

**قوتابییەکە** : سوێندم بە درۆ نەخواردووە و هەرگیز لە راستیش لام نەداوە • وتم : بە خوا من سەعیدم ( واتە بەختیارم ) • وە ئەمە رەوایە ، وە من سوێندم بە خوا بەختیارم ئەوپەڕی بەختیاریی ئەگەر بێت و خۆم بکەمە قوربانی زانای ئیسلام سەعیدی کوڕی جوبەیر •

**پۆلیسەکە** : تا ئەمڕۆ فیداکاریی و خۆنەویستیی وام نەدیوە !! خوا حەججاج بکوژێت • ئەمان کاتە داردەستی

خۆی بۆ ئازاردانی موسلمانان و سزادانی پیاوانی زانیاریی و ئایین • خوا بیبڕێت ئەم کاسپیە پیسە •

( ئینجا ئاوڕ ئەداتەوە بۆ لای سەعید و ئەڵێت )

**پۆلیسەکە :** مامۆستا گیان ! بە خوا وازت لێ دێنم ، وە من تکاکارم لە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتا بە شێوەیە پێی بگەم دەستم پاك بێت لە گرتنی تۆ و تەسلیم کردنت بەو ستەمکارە زۆردارانە ، وە ئێوەش ئەی قوتابیانی مامۆستا ، داواتان لێ ئەکەم کەوا هەواڵ نەدەن بە کەس کەوا ئێوەم دیوە یان ئێوە منتان دیوە•• خۆ ئەگەر ئەو ستەمکارە بەمە بزانێ سزام سەربڕینە •• سەربڕین •• ( دەست نیشان ئەکا بۆ ملی ) بە خوا ئەگەر لە بەر بەخێو کردنی منالە وردەکانم نەبوایە یەك ڕۆژ ئەم ئیشە پیسەدا نەئەمامەوە •• خوایە چاوپوشیی و لێبووردنت •

( پۆلیسەکە دوو هەنگاو ئەڕوا و ئەگەڕێتەوە و ئەڵێ ) چاکتر وایە مامۆستا ئەم ماڵە بە جێ بێڵێ و بچێ بۆ ماڵێکی تری کەنار و دوور لە هات و چۆی خەڵکیی

بەشکوم خوا چاوی ستەمکاران لەئاستیا کوێر بکا •

**یەکێ لە قوتابییەکان :** سوپاس بۆ خوا ، هەتا رۆژی قیامەت چاکە لەم ئوممەتەدا نابڕێ ، بە بیری کێدا تەهات ئەم پۆلیسە خاوەنی دڵێکی ئازا بێت ؟! ( پۆلیسەکە ئەچێتە دەرەوە ، سەعید ئاوڕ ئەداتەوە بۆ لای قوتابییەکانی ) •

**سەعید :** رۆڵە بەڕێزەکانم • بەم کردەوەتان منتان شەرمەزار کرد • وە من بە خوا زۆر بێدەسەڵاتم کەوا سوپاستان بکەم • جا ئەیدەمە دەست خوا تا بە گەورەیی خۆی پاداشتان بداتەوە کە هەر خۆی دەولەمەند و سوپاس کراوە •

ئەی رۆڵەکانم ! ئەوانەی ئەمڕۆ لە بەر خۆشەویستیی ئەم جیهانە یەك ئەگرن و کۆ ئەبنەوە ، سبەینێ هەر لە سەر ئەو ، لە یەك جیا ئەبنەوە ، وە ئەو پەیوەندییەی کە پچڕانی بۆ نیە ، پەیوەندیی ئاینە •• پەیوەندیی شەرمی خوایە • جا هەوڵ بدەن تا پەیوەندییەکەتان بۆ

خوا و لە پێناوی خوادا بەردەوام بێ چونکە هەرچی بۆ خوا بێ هەتا دێت پەیوەستیی زیاد ئەکات و بەردەوام ئەبێت .. ئایا فەرمایشتی خوای گەورەتان نەخوێندۆتەوە کە ئایا دەری ئەخا هەموو دۆست و خۆشەویستێك رۆژێ دێت بنە دوژمنی یەك جگە لە خواترسەکان ، وەك ئەفەرموێ :

ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ الزخرف

ئیتر بە خواتان ئەسپێرم رۆڵە شیرینەکانم .

( پەردە )

# دیمەنی دووەم

**( مامۆستا سەعیدی کوڕی جوبەیر لە کەناری شاری مەککەدا دوور لە ئاوەدانیی خۆی حەشار داوە ، وە هاوڕێیەکی کە ناوی ئەبوحەصین ئەبێ ئەچێتە ژوورەوە لای ) •**

**ئەبوحەصین** ئەی باوکی عەبدوڵڵا ئایا ئەزانی والیی تازەی مەککە[1] لە مزگەوت چی وت بە خەڵکەکە ؟

**سەعید** : چی وت ؟

**ئەبوحەصین** : وتی : « بەو خوایەی سوێندی پێ ئەخۆین و حەجیماڵەکەی ئەکەین هەر کەی سەعید بدۆزمەوە ئەی کوژم و ئەو ماڵەش وا تیایا وێرانی ئەکەم ، بەڵام وا سێ رۆژ مۆڵەتتان ئەدەم » • والیی ئەمەی وت و وەکو دەریا کەف و کولی نەئەنیشتەوە ، وە پێشم گەیشتووە کەوا پیاوێك ئەم شوێنەتی پیشان داوە ، وە

---

(١) والیی مەککە لەو کاتەدا خالیدی کوڕی عەبدوڵڵای قەسریی بووە • / صفة الصفوة / ٣/٧٩ •

ئەنێرێت بە دواتا وەرە بە گوێم بکە و لێرە بڕۆ ٠

**سەعید :** ئەی ئەبا حەصین ئەوەندە زام کرد و خۆم شاردەوە ، هەتا شەرمی خوا ئەمگرێت و تەریق ئەبمەوە ، جا تو خوا وازم لێ بێنە تا ئەو کاری کە خوا بڕیاری لەسەر داوە بکرێ و بێتە دی ٠٠

**ئەبوحەصین :** بە خوا هەر چۆن دایکت ناوتی ناوە سەعید ، بەختیار ، منیش هەروا بە بەختیارت ئەبیم ٠ ئیتر بە خوات ئەسپێرم ٠٠

**سەعید :** ئەتسپێرم بەو خوایەی کە سپاردەکانی لا ون نابن ٠ ( ئەبوحەصین ئەچێتە دەرەوە و تۆزێك دوای ئەوە یەکێ ئەدات لە دەرگاکە ، سەعید سەیر ئەکا پیاوێکە والی ناردوویەتی بۆ گرتنی ) ٠

**پیاوەکە :** والی شوێنەکەتی زانیوە و منی ناردووە بۆ لات ، وە فەرمانی پیا داوم کە بتگرم و بتبەم بۆ لای ، وە پەنا ئەگرم بە خوا لەو کارە ، هەلسە بۆ چ ولاتێك ئەلێی با پێکەوە بڕۆین ٠

**سەعید :** ئەوەندە رام کرد و خۆم شاردەوە هەتا شەرم گرتوومی ، خۆ هەرچی خوا بڕیاری دابێ ئەبێ روو بدات .

**پیاوەکە :** ئێمە ئەبێ لە قەدەری خواوە را بکەین بۆ قەدەری خوا ، وە ئەوەندەی لە تیاچوونی ئەم میللەتە ئەترسم ، لە تیاچوونی تۆ ناترسم ؛ لە ترسی ئەوەی نەوەکو خوا خەشم و قینی خۆی بڕژێنێ بە سەریا ئەگەر بە دەستی ستەمکاران زاناکانی بکوژرێن ، وەرە بە گوێم بکە بە پێکەوە دەرچین وەک مووسا پێغەمبەر ـ علیه السلام ـ لە دەستی فیرعەون هەڵات و ئەرمووی : خوایە رزگارم کەی لە دەست ئەتەوەی ستەمکار ، وەک قورئان ئەفەرموێ :

قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾ القصص

**سەعید :** ( وتەی پیاوەکە کاری تێ ئەکا ) ئایا لێرە ماڵ و منداڵت هەیە ؟

**پیاوەکە :** بەڵێ .

**سەعید :** کەواتە ئەیانگرن و لـە جیاتی منا سزایان ئـەدەن •

**پیاوەکە :** ئەیاندەمە دەستی خوا •

**سەعید :** نا بە خوا ، هەرگیز نابمە هۆی ئازاردانی هیچ موسڵمانێك ، فەرموو ئەوەی فەرمانت پێ کراوە جێ بـە جێی بکە ، خوا پاداشتی ئەم نیەتە چاکەت ئەداتەوە •

**پیاوەکە :** والیی ئەتنێرێ بۆ لای حەججاج ، ئیتر خۆ ئـەزانی چەندە سەرکەش و فیزل و دڵڕەقە !!

**سەعید :** با ئەوەی خوای گەورە ئەیەوێت بێتە دیی • تۆ هیچت لـە سەر نیـە ، ئەوەی فەرمانت پێ کراوە جێ بـە جێی بکـە •

**پیاوەکە :** من خۆم حەزم کردووە والیی بمنێرێت بۆ لات ، تاوەکو پێکەوە را بکەین بۆ شوێنێکی ئاسایش ، جا چۆن دڵم رێگام ئەدات کۆت بخەمە دەستەوە و بتدەم بـە دەست یەکێکی بێبەزەییەوە ؟؟ پیـاوی چاك بـە هەڵسـە با لێرە دەر چین •

**سەعید :** ماڵ و منالەکـەت بـە هـۆی منـەوە ئازار

ئەدرێن • وە هەرگیز دلم بۆ شتی وا رێگام نادات ••
هەرچیم لێ دێ با بێ • چیت بە سەرا دراوە پێی
هەڵمە • ئەوەتان دەستم بیانبەستە •

**پیاوەکە :** ( چاوی پڕ ئەبێ لە فرمێسك و دێتە پێشەوە
و دەستی ئەبەستێت و ئەڵێ ) هەرچی خوا بڕیاری لە
سەر دا بێ گێڕانەوەی بۆ نیە • خوایە خۆت ئەزانی
ئەم کارەم نابەدڵە •••• ئێمە هەموومان بەندەی خواین
و هەر بۆ بەر دەستی ئەو ئەگەڕێینەوە !

( پەردە )

# بەشی سێیەم
# دیمەنی یەکەم

**( لە زیندانیی ئاو بەندیخانەیەکدا ، سێ زانای موسلمانی تیایە کە عامیری شەعبیی و موطریفی کوڕی عەبدوللاوە سەعیدی کوڕی جوبەیرن ) .**

**شەعبیی :** ئەی موطریف ئەم بەیانییە چییت پێیە ؟

**موطریف :** خەونێکم دیوە و زۆر بە چاکی ئەزانم و خۆم وام لێك داوەتەوە کەوا لەم بەندیخانە دژوارە ئەچمە دەرەوە .

**سەعید :** (بە شێوەی بەرهەڵستی کەر) مەرج نیە هەمیشە چاکیی دەرچوون بێت لە بەندیخانە ، بەڵکو چاکیی لە دامەزراندایە لە سەر راستیی . یوسفی راستگۆ – علیه السلام – داوای لێ ئەکرا یا بە کاری خراو هەڵسێ لەگەڵ خێزانی سەرەك وەزیرانی میسردا ، وە یا بخرێتە بەندیخانەوە ، کەچی ئەو بەندیخانەی هەڵبژارد وەك قورئانی پیرۆز بەو دەمیەوە ئەگێڕێتەوە :

قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ... ﴿٣٣﴾ یوسف

**شەعبی :** بەڵام ئەی باوکی عەبدوڵلا تەنها بەندیخانە نیە ، بەڵکو کوشتنە ! سەربڕینە !

**سەعید :** ( ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان ئەخوێنێتەوە کە تیایا باسی خۆشیی و رابواردنی ئەو جیهان ئەکا بۆ ئەوانەی کە لە پێناوی خوادا شەهید ئەکرێن ) .

وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿١٥٧﴾ آل عمران

**موطریف :** ئایا ئەتەوێ سەرت بخەیتە بەردەم ئەو ستەمکارە لە سنوور دەرچووانە ، کەوا نە لە خوا ئەترسن وە نە بەزەیان بە کەسا دێتەوە ؟!

**سەعید :** ( دەست نیشان ئەکا بۆ سەری ) جا چی ئەبێت ئەگەر کوڕی جوبەیر لە رێی خوادا ئەمەی لەدەی ( واتە : سەری لە لەشی ) جیا بکرێتەوە ؟ ( ئینجا بە توندیی و نارەزاییەوە ئەڵێت : ) کوڕینە ئەی لە بیرتان چۆتەوە کەوا ئەوانە چیان لە ئێوە ئەوێ ؟ ئەیانەوێ

لە بەر دەمیانا دان بنێن بەوەدا کە ئێوە لە دژیان دەرچوون و لاتان داوە وە ئێوە بە دەرچوونتان لە دژیان کافر بوونەتەوە ، جا ئایا ئێوە دان ئەنێن بە کافرێتیی خۆتانا ؟

**شەعبیی :** ئەی باوکی عەبدوللا بۆ ناچاریی ماوەی درۆ دراوە • من وتەیەکی پێچراوەی نادیار ئەدەم بە گوێیا خۆم لە وەڵامی راستەقینە ئەدزمەوە • جا بۆچ تۆش وەك ئێمە ناکەی تا سەرت دەر کەی ، ئەی سەعید ؟

**سەعید :** ئەبێ سەری سەعید لە چاو سەری پێغەمبەرەکان و راستگۆکان و شەهیدەکان و پیاوچاکەکاندا چی بێ؟ ئەی گوایە زەکەریای پێغەمبەری خوا ـ علیه السلام ـ بە مشار نەکرا بە دوو کەرتەوە ؟ ئەی یەحیای پێغەمبەری خوا ـ علیه السلام ـ سەر نەبڕرا ؟ ئەی لە پێغەمبەری خواوە ـ صلی الله علیه وسلم ـ نەتان گێڕاوەتەوە کەوا فەرموویەتی چاکترین جیهاد لە پێناوی خوادا وتەیەکی رەوایە لە بەردەم دەسەڵاتدارێکی ستەمکارا ، کە وەك ئەفەرموێ :

« **أفضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر** » ؟
ئەی عومەر و عوثمان و عەلیی و حوسەین ـ خوا لێیان رازیی بێ ـ بە ستەم نەکوژران ؟

**شەعبیی** : بەڵێ ، وە تۆیش وتەی رەوات وت ، بەڵکو لە پێناوی ئەو وتە رەوایەدا جەنگیت ، ئینجا خوای گەورە ئەوەی ویست بۆمان کە ئەیبینی ، جا چار نیە ئەبێ ئارام بگرین ، هەتا هەڵێکی ترمان دەست کەوێ .

**سەعید** : هەروا لە سەر وتەی رەوا ئەمێنمەوە : پێی ئەژیم و لە سەری ئەمرم ، وە پێی دژی ستەم و جەوری ستەمکاران ئەوەستم ، « والله غالب علی أمره » .

**دوطریف** : وا تۆ ئەمڕۆ وتەی راستییت بێ پێچ و پەنا وت ، ئایا ستەم و جەوری ستەمکاران لا ئەچێ ؟ وە گرێ کوێرەکە ئەکرێتەوە و دنیا تەخت ئەبێ ؟

**شەعبیی** : نە . سەعیدی کوڕی جوبەیری زانای شارەزای ئیسلام ئەکوژرێ و حەججاجی ستەمکاری لە سنووردەرچوو ئەمێنێت و دەوڵەتی ستەم و ناڕەوا وەك خۆی ئەمێنێتەوە .

**سەعید :** (بە توڕەییەوە) ئەمە چیە لێتانی ئەبیستم ؟ کەی ئەگرنجێ ئێوەمانان شتی وا بڵێن ؟ کەی خۆش ویستنی ژیان مەبەستی پێغەمبەران و کەلەپووربەرانی پێغەمبەران ( زانایان ) بووە ؟ دە بە خوا هەر شەهیدێك لە پێناوی ئیسلاما شەهید ئەکرێ ، زەویی لە ژێر پێی ستەمکارانا دێتە لەرزە و ، با ماوەیەك جەوڕ و ستەم بمێنێتەوە ، بەڵام بە شێوەیەك ئەمێنێتەوە کە هەمیشە دڵە تەپەی بێت و بێبەش بێت لە حەسانەوە و ئاسایش و بێخەمیی • بەڵام ڕەختی ئیسلام هیچ شتێ تینوێتیەتیی ناکوژێنێتەوە جگە لەو خوێنە گەشەی کە لە پێناویا ئەڕژێت •• ئەو خوێنەی کە ئەیسەلمێنێ نەتەوەی ئیسلام هێشتا لە سەر چاکە ماوەتەوە ، وە هی وای تیایە کە بە ئارەزوو و هەڵبژاردنی خۆی ، خۆی ئەفرۆشێ بە خوا • ( شەعبیی و موطریف وتە تیژەکانی سەعید کاریان تێ ئەکا ) •

**شەعبیی :** ببوورە ئەی باوکی عەبدوڵلا ، ئێمە تەنها خەمی تۆمانە ، تا بمێنیت و کەڵك بە نەوەی ئیسلام

بگەیەنیت ، چونکە موسڵمانان پێویستیان بە تۆ هەیە ئەی سەعید ، پێویستیان بە رانیاریی و شارەزایی تۆ هەیە ۰
**سەعید :** ئەی شەعبیی هەر وەك خەڵکیی پێویستیان بە یەکێکە کەوا لە ئایین شارەزایان بکا ، هەروەش پێویستیان بە یەکێك هەیە تا دامەزرانیان لە سەر ردوا لە رووی ستەمکاران و زۆرداراندا پیشان بدا ۰

**موطریف :** ئێمە هەمیشە خۆمان لە تۆ بە پایە کەمتر ئەزانین ئەی سەعید ۰۰ وازی لێ بێنە ئەی شەعبیی ، بە خوا وا ئەزانم سەیری خوێنی شەهیدیی ئەکەم لە دەم و چاویا گەشە ئەکا ۰

**سەعید :** ( ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەخوێنیتەوە بۆیان کە موسڵمان ئەبەستێت بە خوا وە و ترسی هیچ هێزێك لە دڵیا ناهێڵێت و ئەیباتە ناوچەقی دڵیەوە کە هەرچی خوا نەی نووسیێ لە چارەی موسڵمان کەسێ ناتوانێ تووشی بکا و هەر ئەو کۆمەك و پشتیوانی هەموو موسڵمانێکە و پێویستە موسڵمانان هەر پشت بەو بەستن ، کە ئەفەرموێ : )

قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَانَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ (٥١) التوبة

( زیندانەوانەکە دەرگای زیندان ئەکاتەوە و سێ بەندکراوی تر دێنێتە ژوورەوە ، ئینجا ئەچێتە دەرەوە و دەرگای زیندانەکە لە سەریان دا ئەخا . هەموویان بێ دەنگ ئەبن ) .

( یەکێ لە سیانە تازەکان کۆتایی بەم بێ دەنگیە دێنێت و لە سێ مامۆستاکە نزیك ئەبێتەوە و ئەم پرسیارە لە موطریفی کوڕی عەبدوڵلا ئەکات ) .

**پیاوەکە :** وەڵامم بدەرێ مامۆستا گیان ، خوا زانیاریەکەت بە کەڵك بەخش بگێڕێ .

**موطریف :** ئا ئەو دووانە پێشەوا و شارەزای کووفەن ، ئەوان وەڵامت ئەدەنەوە ..

**پیاوەکە :** ئەم دووانە کێن خوا لێت ببوورێ !!

**موطریف :** ئەمەیان سەعیدی کوڕی جوبەیرە و ئەوەشیان عامیری شەعبیە .

**سەعید :** ئەمەش موطریفی کوڕی عەبدوڵلایە .

**پیاوەکە :** لا حول ولا قوة الا بالله !! زانایان بەند ئەکرێن و ئازار ئەدرێن !! وە ناپاکە ستەمکارەکان بە سەربەستیی را ئەبوێرن .

( پیاوەکە روو لە سەعید ئەنێ و لێی ئەپرسێ )

وەڵامم بدەرەوە مامۆستا گیان ، سوێندم بە سێ تەڵاقەی ژنەکەم خواردووە کەوا : حەججاج لە ئاگردایە ، ئایا تەڵاقی ژنەکەم ئەکەوێت ؟

**سەعید :** بپرسە لە شەعبیی با ئەو وەڵامت بداتەوە .

**پیاوەکە :** ( روو لە شەعبیی ئەکا ) تۆ چی ئەفەرموویت ؟

**شەعبیی :** کابرا ، ئەگەر حەججاج دوای ئەو هەمووەی کە کردوویەتی بچێتە بەهەشتەوە ، دە بە خوا هیچ زیانی نیە تۆیش لەگەڵ ژنەکەتا بە بێ تەڵاق ژیان بدەیتە سەر !!

**پیاوەکە :** بە خوا دڵم ئاوی خواردەوە .

( یەکێکی تریان لە شەعبیی نزیک ئەبێتەوە و لێی ئەپرسێ ) .

**پیاوەکەی تر :** وەڵامم بدەرەوە مامۆستا گیان خوا کۆمەکیت بکا ، ئایا حەجحاج کافرە یا ئیماندارە ؟

**شەعبیی :** ( بە گاڵتەوە ) حەجحاج ئیماندارە ٠

**پیاوەکە :** ( بە نارەزاییەوە ) چۆن ؟ حەجحاجی ستەمکاری دەست درێژیکەری زۆرداری لەناوبەری موسڵمانان و دوژمنی پیاوچاکان و زەلیلکەری سەربەستان و فیرعەونی عەرەب ، ئیماندارە ؟؟!!

**شەعبیی :** بەڵێ ئیمانی بە زۆر و ستەم و لادان هەیە و کافرە بە فەرمایشتی خوا !

**پیاوەکە :** ئەمەیان راستە ٠

( زیندانەوانەکە دێتە ژوورەوە و سەیر ئەکا بەندکراوەکان بە بێ دەنگ دانیشتوون ) ٠

**زیندانەوان :** ئەوە چیتانە من هاتمە ژوورەوە هەموو بێدەنگ بوون ؟

**سەعید :** خوا لەو کەسە خۆش بێ کە چاکە ئەڵێ و قازانج ئەکا ، وە یا بێدەنگ ئەبێ و بێوەی ئەبێت ٠

**زیندانەوان :** مامۆستا گیان ، من بە پیاوچاکت ئەزانم

لــه بارەی یارمــەتیی‌دەرانــی ستەم‌کارانــەوە چــی ئەفەرموویت ؟

سەعید : یارمــەتیی دەرانی ســتەم‌کاران صــەکی ناو دۆزەخن کە بە وێنەی سەگ تیایا ئەوەڕن ..

**زیندانەوان :** ئەی لە بارەی منەوە چی ئەفەرموویت ، ئایا من لە یارمەتیی‌دەرانی ستەم‌کارانم ؟

**سەعید :** نــەء ، یارمەتیی‌دەرانی ستەم‌کاران ئەوانەن جلیــان بۆ ئەشۆن ، وە نایان بۆ دروست ئەکەن ، ... وە ... ، ...

**زیندانەوان :** ( بە سەرسوڕمانەوە ) ئەی من ؟!

**سەعید :** تۆ ؟ .. تۆ لــە ستەم‌کارەکان خــۆیانی ، ئایا تۆ بەژداریی ناکەی لــە ئازاردانی خەڵکیدا ؟! کاتێ خوای گەورە لەعنەتی کردە فیرعەون و هامانی وەزیری، لەگەڵیانا لەعنەی کردە سەربازەکانیشــیان ئەها خــوای گەورە لــە قورئانا ئەفەرموێ :

فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ القصص

وە ئەفەرموێ :

إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَـٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ القصص

**زیندانەوان :** بەڵام من ناتوانم پێیان بڵێم : نا !!
**سەعید :** ئەگەر بە دڵڕەقیان نەزانیتایە ئـەو کارەیان

پێ نەئەسپاردی .

**زیندانەوان :** من لە سەر ئەوە کرێ وەر ئەگرم ئەگەر ئـەوە نەبێ منداڵەکانم لـە برسانا ئەمرن .

**سەعید :** رۆزیی خوا لە هەموو شوێنێکدا هەیە ، جا ئەگەر ئەتەوێ ( لە ستەمکاریی رزگارت بێ ) بگـەرێ بۆ ئیشێکی تر ، و هاوبەشیی مەکە لـە سـتەمدا .. وە هەر کەس لەگەڵ خوادا راست بکا ، خوابش بە راستیی لەگەڵیا ئەبێت .. ئەها ئەم ئایەتە پیرۆزە چۆن بەڵێن ئەدا بەو موسڵمانانـەی کە شـەرمی خوا ئەکـەن ، چـۆن دەربازیان ئەکات و رۆزیان ئەداتێ ، وە هەرکەس پشت بـە خوا ببەستێ ئەوی بەسە ، کە ئەفەرموێت :

... وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ... ﴿٣﴾ الطلاق

**زیندانەوانەکە :** ( دەست بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمان ) خوایە تۆ ئەزانی من لای ئەم کاربەدەستانە پاسەوانی بەندیخانەم و دلیشم نەفرینیان لێ ئەکات .. خوایە پەنا ئەگرم بە تۆ لەوەی کە ستەم کار بم وە یا یارمەتیدەری ستەمکار بم .. خوایە لەوەی رابووردوم چاوپۆشییم لێ بکە و لەوەیشم کە ماوە دەرگای سەرفرازییم بۆ بکەرەوە [1] .

**( پەردە )**

---

(١) موسلمان ئەبێ وەك سەعید لە سوورەتی (یوسف) تێ بگا کەوا لە هەموو شوێنێکا کاری سەرشانی موسلمان بانگکردنە بۆ لای خوا و خوایش بەرەکەت ئەخاتە ئیشەکەیەوە .

# دیمەنی دووەم

( حەججاج لە ئەنجومەنی فەرماندایەتییدا شانی دا داوە ، و لە لای چەپیەوە هەندێ لە دەستوپێوەندەکانی وەستاون . لەم کاتەدا سەرۆکی پۆلیس دێتە ژوورەوە ) .

**حەججاج** : ئەو سێ تاوانبارە یەك لە دوای یەك با بێنە ژوورەوە . ( موطریفی کوڕی عەبدوڵلا ئەنێرنە ژوورەوە ) .

**حەججاج** : زانییت ئەمیری موسڵمانەکان لە بارەتانەوە چی نووسیوە بۆمان ؟

**موطریف** : زانییم .

**حەججاج** : تۆ کافری یا موسڵمان ؟

**موطریف** : خوا فەرماندە چاك کات . بە راستیی ئەوەی دەستی دایە یاخیبوون و پەیمانی شکاندەوە و ناپاکیی کرد لە سپاردەدا و لە رێ و شوێنی پێغەمبەر ـ صلی الله

علیه وسلم ـ لای دا و ترسی خستە دلی موسلمانە کانەوە شایانی کافرێتییە •

**حەججاج :** ( بە خۆ هەلکێشان و شانازییەوە بەوانەی دەوروبەری ) **دانی نا بە کافرێتیی خۆیا** و رزگاری **بوو** •• وازی لێ بێنن •

**دەستوپێوەند :** ( هەندێکیان بە هەندێکیان بە دەنگێکی نزمەوە ) بە خوا لەوە ئەچوو لەگەڵ فەرماندەی بێت •

( عامیری شەعبیی دێتە ژوورەوە و دەرگەوان بە چپەوە ئەدا بە گوێیا ) •

**دەرگەوان :** دان بنێ بە کافرێتیی خۆتا و سەرت دەر کە • ( لەم کاتەدا حەججاج سەری دا خستبوو هەستی پێ نەکرد • کاتێ سەری بەرز کردەوە ، چاوی پێ کەوت ) •

**حەججاج :** تۆیش ئەی شەعبیی ، لەوانە بووی دژمان وەستان و یارمەتیی دوژمنانیان دا و هەوڵی ئاژاوەنانەوەیان دا ؟

شەعبیی : خوا فەرماندە چاك کا ، خەڵکیی ئامۆژگاریان کردم بە شتانێ تا پێتی بڵێم بۆ ئەوەی تۆ رازیی کەم و خـوای گەورە برەنجێنم ، وە من وا ناکەم ، بەڵکو وتەی راستییت پێ ئەڵێم :

ئەی فەرماندە ، ئاژاوەیەکی کوێرانە سەری لـێ شێواندین نە ئەوە بوو زۆر پیاوچاك و لەخواترس بین وە نـە ئەوە بوو پیاوخراپی کردەوە پیسی بە هێـز بین ، هەتا وامان بە سەر هات کە هات ..

حەججاج : ( بـە دەست و پێوەندەکەی ) راسـت ئەکا . بە خوا نە پیاو چاك و لە خواترس بوون ، تا لـە موسڵمانێتیی خۆیانا نەیەن بە گژمانا ، وە نە پیاو خراپی بەهێز بوون تا زاڵ بن بە سەرمانا[1] . برۆ ئەی شەعبیی وا چاوپۆشییمان لێ کردیت .. مامۆسـتای خرابـە و سـەروکی ئاژاوە بێنن .

( سەعیدی کوڕی جوبەیر دێتە ژوورەوە ) .

---

(١) نیـازی شەعبیی لـە کوێ و روونکردنەوەکەی حەججاج لە کوێ ؟!

حەججاج : ( بە خۆ نابەڵەد کردنەوە ) تۆ کێیت ؟

سەعید : سەعیدی کوڕی جوبەیر .

حەججاج : بەڵکو شەقیی کوڕی کوسەیر(١) .

سەعید : دایکم زاناتر بووە بە ناوی خۆم و باوکم تا تۆ .

حەججاج : بە خۆت و دایکتەوە هەر بەدبەخت بن .

سەعید : بەدبەخت یەکێکە شایستەی دۆزەخ بێت ، ئایا تۆ ئاگادار کراوی لە غەیب ؟

حەججاج : بۆچ رات کرد و ئەم هەموو ماوەیە خۆت شاردەوە ؟

سەعید : ئەوە ئەڵێم کە مووسا ـ علیه السلام ـ فەرمووی بە فیرعەون :

فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ .... (٢١) الشعراء

---

(١) واتە : بەڵکو بەدبەختی کوڕی تێکشکاو .

**حەججاج :** ( بە توندییەوە ) ئەوە مەبەستت لە منە ؟

**سەعید :** ( بە هێمنییەوە ) بەڵکو ڕاستیی دەر ئەخەم •

**حەججاج :** ئایا تۆ کافری یا موسڵمان ؟

**سەعید :** ( بە هێزێکەوە ) لەو کاتەوە موسڵمان بووم کافر نەبوومەتەوە •

**حەججاج :** داوای موسڵمانێتیی ئەکەی ئەی **مونافیق**[۲] ؟! **بە خوا ئەبێ مەرگت دەرخوارد بدەم !**

**سەعید :** ( بە پەرمین و حەسانەوەوە ) کەواتە دایکم پێکاویتی کاتێ ناوی ناوم سەعید ( بەختیار ) • جا چە بەختیاریەك گەورەترە لە شەهیدبوون لە پێناوی خوادا و لە تەنیشت سەرداری شەهیدان ، حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیبەوە ؟

**حەججاج :** ( بە گاڵتە و هەڕەشەوە ) لە تەنیشت هیچ

---

(۲) هەمیشە زمانی دەسەڵاتدار درێژە • هەرچی بوێت ئەتوانێ بیلێ و بیسەپێنێ بە سەر بێدەسەڵاتاندا •

کەمەوە نابێت جگە لە تەنیشت دەرچووەکان و چاتۆڵبازەکانەوە ، وە لەم جیهانەشدا ئەتکەمە ئاگرێک بڵێسەت بڵێسەی بخوانەوە •

سەعید : ( بە پەرمینەوە ) ئەگەر بمزانیایە ئەوەت بە دەستە ئەو کاتە لە جیاتی خوا تۆم ئەپەرست •

حەججاج : ( بە توورەییەوە ) تیا چیت ئەی بەدبەخت !!

سەعید : بەڵکو تیاچوون بۆ ئەو کەسەیە کە لە بەهەشت لای پێ بدرێ و بخرێتە ئاگرەوە •

( حەججاج باسەکە ئەگۆڕێت )

حەججاج : رات چۆنە دەربارەی خەلیفەکان ، وە کامیانت لە لا چاکترە ؟

سەعید : ( ئەم دەرگایەی لە رووا دا ئەخات ) نەدراونەتە دەستم تا کارێکم بە سەریانەوە بێ و ئاگاشم لە کاروکردەوەیان نیە •

حەججاج : کامیانت لا خۆشەویستترە ؟

**سەعید :** ئەوەیان کە زیاتر پەروەردکاری لە خۆی رازیی کردبێ •

**حەججاج :** ئەی کامیان زیاتر پەروەردکاری لە خۆی رازیی کردووە ؟

**سەعید :** زانینی ئـەوە لای ئەوەیە کـە ئاگای لـە ئاشکرا و نهێنییان هەیە •

**حەججاج :** نەتویست راستییم پێ بلێی •

**سەعید :** بەلکو نەمویست درۆت لە گەلا بکەم •

**حەججاج :** ئەی دەربارەی موعاویە چی ئەلێیت ؟

**سەعید :** بە خەریك بوونم بە ئیش و کاری خۆمەوە ، نـەم پەرژاوە لە کار و کردەوەی خەڵك ورد ببمەوە و بڕیاری چاکیی و خراپیان لە سەر بدەم •

**حەججاج :** لە وەلامدانەوە را ئەکەیت ؟!

**سەعید :** سەرفرازیی بۆ ئەوکەسەی هەر بە کەم و کوڕیی خۆیەوە خەریکە و نایەرژێ بە لای کـەم و کوڕیی خەلکەوە •

**حەججاج :** رات چیە دەربارەی جەنگی عەلیی و موعاویە ؟

**سەعید :** ئەوە خوێنێك بوو خوا نەیویست دەستی ئێمەی پێوە بتلێ ، جا چاك وایە خۆیشمان زمانمانی پێوە نەتلێنین .

**حەججاج :** ئەی دەربارەی من چی ئەلێیت ؟

**سەعید :** تۆ خۆت چاكتر خۆت ئەناسیت .

حەججاج : بەلام ئەمەوێ رای تۆیش بزانم .

**سەعید :** كەواتە پێت ناخۆش ئەبێت و دلت خۆش ناكات .

**حەججاج :** هەرچەند ... پێم خۆشە بیزانم .

**سەعید :** لێم گەرێ ..

حەججاج : خوا لێم نەگەرێ ئەگەر لێت گەرێم .

**سەعید :** جا كە هەر ئەبێ وا بێ ، من ئەزانم تۆ بە پێچەوانەی فەرمایشتی خوا و سوننەتی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ وە رێبازی خەلیفە

پێ گەیشتووەکانی پێغەمبەر ئەجوڵێنەوە ، هەندێ شت لە خۆتا ئەبینی ئەتەوێ بەوانە پارێزگاریی سام و دەسەڵاتت بکەیت • بەڵام هەر ئەو شتانە لە ناوت ئەبەن سبەینێش ئەچینەوە بەردەم خوا ، جا ( هەموو شتێ ) ئەزانیت •

**حەججاج** : ئەی من سوپا و لەشکرم نەناردوون تا لـە پێناوی خوادا بجەنگن ؟ ئەی من موحەممەدی کوڕی قاسمی ئەقەفیم نەناردووە بۆ رزگارکردنی وڵاتی سەند؟ ئەی من ئاسایشم لـە عێراقا دا نەمەزراندووە ؟!

**سەعید** : بەڵێ •• بەڵام تۆ زۆرداریی ئەکەیت لـە سەر زەویدا ، دەست ئەخەیتە خوێنی خەڵکیەوە ، وە پێغەمبەریش ـ صلى الله عليـه وسلم ـ ئـەفەرمـوێ : « نەمـانی جیهان ئاسانترە بـە لای خواوە لـە کوشـتنی پیاوێکی موسڵمان » • ئەی ئەبێ ئەو کەسە چی بکا کـە بـە هەزارەها موسڵمانی کوشتبێ ؟ تۆ ئـەی حەججاج ئەتەوێ بەندەکانی خوا بکەیتە بەندەی خۆت ، لە چاکە و خراپەدا ملکەچت بن ، وە لە رەوا و ناڕەوادا بڵێن :

بیستمان و ملکەچین • خـۆ ئاینـەکەی ئێمـەیش دان نانێ بـە ملکەچیدا جگە لـە چاکەدا • وە پێغەمبەری خۆشەویست ـ صلی الله علیه وسلم ـ بڕیاری داوە کە هەر کەسێ لە خوا یاخیی بوو ملکەچیی ناکرێ بۆی ، وەك ئەفەرموێ :

« لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق » •

**حەججاج :** گوایە تۆ ئەتەوێ ئێمە جلەو شل کەین بۆ پیاوخـراپ و ئارەزووبـەرستان تا پەیمان پیا بـەن ؟ پێویستە ، بەر لەوەی ئەوان ئێمە بکەنە خۆراکی شێوان، ئێمە ئەوان بکەینە خۆراکی نیوەڕۆ •

**سەعید :** بـەڵام ئایینی خـوا ئـەم زەمـە خۆراکییە ناشیرینانەی تیـا نیـە ، کۆمەڵێك بۆ خۆراکی نیوەڕۆ و کۆمەڵێکیش بۆ شێوان ! ئەگـەر تۆ قیامەت بویسـتایە ـئەی حەججاجـ هەرگیز دەست بەرداری نەئەبوویت بۆ ئـەو دەسەڵاتەی کە ئەگەر ئەمڕۆ هەبێت ، سبەی ڕۆژ هـەر تیـا ئەچێت ••

( حەججاج خۆی گیف ئەکا و ، تووڕەیـەکەی

ئەخواتەوە و باسەکە ئەگۆڕێ ) •

**حەججاج :** من لە تۆ لای خوا خۆشەویستترم •

**سەعید :** خوای گەورە تەنهـا خۆی غەیب ئەزانێ ، وە سبەینێ هەموو کەسـێ چی کـردبێ پاداشـتی ئەو کردەوەیەی وەر ئـەگرێتەوە ، کـەسیش ستـەمی لێ ناکرێ •

**حەججاج :** من لەگەڵ پێشەوای کۆمەڵی موسڵمانانم ، وە تۆ لەگەڵ پێشەوای دووبەرەکیی و ئاژاوەیت •

**سەعید :** وەک عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ـ خـوا لێی خۆش بێ ـ فـەرموویەتی : « کۆمـەڵی ئیسـلامیی ئـەوەیـە لـە گەڵ ڕەوادا بێت ، ئەگەر چی تۆ خۆت بە تەنیا بی ، وە ئـاژاوە ، ئـازاردان و هـەڵ گێڕانـەوەی خەڵـکیە لـە ئـاینەکەیان » •

**حەججاج :** ئەمانە رایە گومڕاکەرەکانتن کە ئەیانبەیتە مێشکی قوتابیەکانتەوە •

**سەعید :** بەڵکـو ئـەمە زانیاریی پێغەمبەری خـوایە

ـ صلى اللـه عليه وسـلم ـ كەوا هاوەڵـەكانى لێيـان وەرگرتووە و ئێمەیش لەوانەوە گێڕاومانەتەوە •

**حەججاج :** ئایا نابینی چیمان کۆ کردۆتەوە بۆ ئەمیری موسڵمانەکان •

**سەعید :** هیچم نەبینیوە •

**حەججاج :** ئادەی کوڕە ، هەندێ لەو ئاڵتوون و زیو و پۆشاك و مرواریە بێنە •

( خزمەتکارێك ئامادەیان ئـەكات و ئـەیان خاتـە بەردەم حەججاج ) •

**حەججاج :** رات چیە دەربارەی ئەمە ؟[1]

**سەعید :** شـتێکی باشـە ئەگـەر بـە مەرجەکـەی هەڵسیت •

**حەججاج :** مەرجی کامەیە ؟

---

(١) حەججـاج هەڵوێستێکی رووخـاوی بـەزێنراوی هەیە ، ساتێ سەعید بە کافر و یاخیی ئـەداتە قـەڵـەم ، ساتێکیش بـە موفتیی و پرسـیاری شەرعیی لێ ئەکات !!

**سەعید :** ئەوەیە کە بـە حەڵاڵیی وەری گری و لـە شوێنی خۆیا خەرجی بکەیت و بۆ خاوەنی خۆی رژدیی تیـا نەکەی ، ئەگینا راچڵەکینێکی رۆژی قیامەت هەرچی شیردەر هەیە ئاگای لەوە نامێنی کە شیری داوەنێ ، وە هەرچی بەردار ( سك پڕ ) هەیە بەرەکەی ئەخات •

**حەججاج :** ئایا پێت خۆشە لەم ئاڵتوون و سامانەت بوایە ؟

**سەعید :** هـەرچی خـوای گەورە پێی ناخۆش بێت منیش پێم ناخۆشـە •

**حەججاج :** ( دیسـان باسەکە ئەگۆڕێ ) واز لـەمە هەمووی بێنە، ئەڵێن تۆ هەرگیز پێ نەکەنیوی !! نهێنیی ئەمە چیە ؟!!

**سەعید :** لە ژیانا شتێکم نەبینیوە کە شایانی پێکەنین بێت !! وە چۆن پیاوێ رێگای بە سەر دۆزەخەوە بێت پێ نەکەنێ ، بێ ئەوەی بزانێ ئایا رزگاری ئـەبێ و تێپـەڕ ئەکا ، یا بە سەر ئەژنۆدا ئەکەوێتە ناویەوە ؟!

وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾

**حەججاج :** ئەی ئێمە بۆ پێ ئەکەنین ؟

**سەعید :** **دلی هەموومان وەك یەك نیە ، وە هەموو کەسێ ئەوەی لا ئاسانە کە بۆی دروست کراوە .**

**حەججاج :** ئایا گوێ ناگری بۆ عوود و شمشال ؟

**سەعید :** کاروباری قیامەتم گالتە و گەپی لە بیر بردوومەتەوە .

**حەججاج :** ( بە دەست و پێوەند ) عوود و شمشال ئامادە کەن .. ( **شمشال دێنن و شمشالژەنێك فووی پیا ئەکا و سەعید دەست ئەکا بە گریان ) .**

**حەججاج :** بۆچی ئەگرییت ؟! خۆ ئەمە گالتە و رابواردنە !

**سەعید :** بەلکو ئەوە مات و مەلوولییە . ئەو فووپیاکردنە کارێکی گەورەی بیر خستمەوە .. ئەو رۆژەی بیر خستمەوە کە فوو ئەکرێت بە صوورا و هەموو کەسێ زیندوو ئەبێتەوە و هەموویان لە مەیدانی

حەشرا کۆ ئەبنەوە • کە وەك قورئان ئەفەرموێ :

يَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ النبأ

وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾

سورة يس

**حەججاج :** ئەتەوێ بە قسەی لووس خاوم بکەیتەوە تا چاو پۆشیت لێ بکەم ؟

**سەعید :** ( بە سەری بەرزەوە ) ئەگەر مەبەست لە چاوپۆشیی بێت ؟ چاوپۆشیی بە دەستی خوایە ، بەڵام تۆ ـ ئەی حەججاج ـ نە رزگارت ئەبێ و نە بیانووشت دەست ئەکەوێ •

**حەججاج :** ( بە تووڕەییەوە ) کەواتە بە چ شێوەیەك ئەتەوێ بتکوژم ئەو شێوەیە بۆ خۆت هەڵ بژێرە •

**سەعید :** ( بە دامەزراوییەوە ) **بەڵکو تۆ بۆ خۆتی هەڵ بژێرە ئەی حەججاج • بە خوا بە هەر شێوەیەك بمکوژی خوا لە قیامەتدا بەو شێوەیە ئەت کوژێتەوە •**

**حەججاج :** بە خوا بە شێوەیەك ئەت کوژم کەوا لە

پێشمـتەوە کەسم وا نەکوشتبێ و کەسیش لـە دواتـەوە وا نەکوژم !!

**سەعید :** کەواتە تۆ ئەم جیهانە لە من تێك ئەدەی و منیش ئەو جیهان لـە تۆ تێك ئەدەم •

حەجاج : **ئادەی کـوڕە ، ئـەو شمشێر و نێزەیە بێنـە • ( خزمەتکارەکە شمشێر و نێزە ئامادە ئەکات ) •**

**حەجاج :** بی‌بەن ••

( خزمەتکارەکە سەعید ئەبات کاتێ سەعید رووی وەرگێڕا پێکەنیی •• یەکێ لە دانیشتوان حەجاجی لە پێکەنینەکەی سەعید ئاگادار کرد ) •

**حەجاج :** بیگێڕنەوە •• ئەی تۆ نەت وت هەرگیز پێ ناکەنم ؟ ئەی ئەم ساتە بە چیی پێ ئەکەنیت ؟ •

**سەعید :** بـە جەرگ سەختیی تۆ بەرامبەر خـوای گەورە و نەرمیی خوایش لەگەڵتـا •

**حەجاج :** ( پییش ئـەخـواتـەوە ) بی‌کـوژن ••

**سەعید :** ( روو بە کەعبە ئەوەستێت )

إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ الانعام

**حەججاج :** رووی کەنە رووکەی گاورەکان ، ئەوانەی پەرتەوازە بوون و بە ناڕەوا جیاوازیان تێ کەوت ، چونکە ئەو لە پێڕی ئەوانە •

**سەعید :** ( بە زەردە خەنەوە ) ـ

وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ .... ﴿١١٥﴾ البقرة

**حەججاج :** ( قینەکەی زیاتر ئەبێت ) بیخەن بە رووا دەمەو نخونی بکەنە زەویی •

**سەعید :**

مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾ طه

**حەججاج :** سەری بڕە دوژمنی خوا ، چەندە زمانی بە قورئان پاراوە •

**سەعید :** بەلام من شایەتیی ئەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوای گەورە و

موحەممەدیش بەندە و پێغەمبەری خوایە • لێمی وەرگرد ئەی حەججاج تا رۆژی قیامەت پێم ئەگەیتەوە •• خوایە دەسەلاتی نەدەیتێ دوای من بتوانێ کەسی تر بکوژێ[1] ••

( پــەردە )

---

(١) لەو کاتەدا کە ئەیبەن بۆ کوشتن ، کوڕەکەی بانگ ئەکا و ئەویش دەست ئەکا بە گریان •• سەعید ئەڵێ : ئەوە بۆ ئەگریت ؟•• مانــەوەی باوکت دوای پەنجا و حەوت سال چی تیایە ؟
حلية الاولياء / ٤/٢٧٥ ، صفة الصفوة / ٣/ ٨٠

# دوايين ديمەن

**( حەججاج لە سەر جێگاکەی خەوتووە ·· لـە خەوێکی قووڵدا نوقوم بووە ·· لە ناکاوا را ئەچڵەکێ و هاوار ئەکا ) ·**

**حەججاج :** بگەنە فریام ·· بگەنە فریام ·· بگەنە فریام ·· لـە دەستی رزگارم کەن ·· بەراستیی ئەیەوێ بمخنکێنێ ·· ئەیەوێ بمکوژێ !

( خزمەتکارێکی ئەچێتە ژوورەوە لای ) ·

**خزمەتکارەکە :** ئەوە کێیە گەورەم ؟ خۆ کەس لێرە نیــە !!

**حەججاج :** ئەوە ئەو ··· سە ·· سە ··· سەعید ·

**خزمەتکارەکە :** سەعید ؟! سەعید کێیە ؟

**حەججاج :** تیــا چیت ! سەعیدی کوڕی جوبەیر ·· دەست ئەخاتە قوڕگم ·· خەریکە ئەم کوژێ ·

**خزمەتکارەکە :** دوو حەفتەیە سەعید کوژراوە ·

**حەججاج :** تۆ شوێن پڕوپووچ کەوتوویت ، سەعید نەمردووە •• وەکو وشتری سەرکەش ساتێ لەمەو بەر دیم •• ئەیویست قوونم بدات ••

**خزمەتکارەکە :** ئەمانە خەو و خیاڵاتن گەورەم •• سەعید مرد •• کوژرا •• تۆ خۆت کوشتت •

**حەججاج :** نا •• نا •• من نەم کوشتووە •• من نەم کوشتووە •• ئەوانە کوشتیان ••

**خزمەتکارەکە :** تۆ بی و ئەوان بن ، گرنگ ئەوەیە ئەو کوژرا و مرد ئەسپەردە کرا •

**حەججاج :** هەتیوە کەرە ! ئەتەوێ قایلم کەی بە مردنی پیاوێك کەوا تۆزێ لەمەو بەر بە سەر سەرمەوە بوو و دەستی خستبووە قوڕگم ؟! تیاچوون بۆ حەججاج! کەسێ باوەڕی پێ ناکا هەتا خزمەتکارەکەشی • دەرگاکەم لە سەر دا خە و لێم گەڕێ ! ( خزمەتکارەکە ئەچێتە دەرەوە ، ئینجا ئەوەستێ و ئەڵێ ) •

**خزمەتکارەکە :** پاك و بێگەردیی بۆ تۆ خوایە ! هەر

کەسێ بتەوێ سەربەرزی ئەکەیت و هەر کەسێکیش بتەوێ سووك و رسوای ئەکەیت .. بە راستیی بێدەسەلاتیی حەججاج ئەمڕۆ بەڵگەیە لە سەر بوونت و لە سەر دادپەروەریت ئەی سەرداری فەرمانڕەوایان!

(حەججاج بە سەر جێگاکەیەوە پاڵ ئەکەوێتەوە .. زۆری پێ ناچێ هەتا ئەم دەنگە لە گوێیا ئەزرنگێتەوە).

— **بەلکو تۆ بۆ خۆتی هەلبژێرە ئەی حەججاج . بە خوا بە هەر شێوەیەك بمکوژی خوا لە قیامەتدا بەو شێوەیە ئەتکوژێتەوە .**

( جارێکی تر حەججاج لە خەو را ئەچلەکێ ) .

**حەججاج** : ( بە دەنگی بەرز ) ئای .. تکات لێ ئەکەم .. تکات لێ ئەکەم .. مەمکوژە .. مەمکوژە .. ئاه .. ئاه ..

( خزمەتکارەکە دێتەوە ژوور )

**خزمەتکارەکە** : چیتە گەورەم ؟! وەرەوە سەر خۆت .. مەترسە .

**حەججاج** : ( بە دەم لەرزەوە ) چۆن نەترسم ؟

تارمایییەکەی بە جێم نایەڵێ • ئەوەتا لە بەر دەمما • ئـا ئەوە ئەوە •• گوایە نای‌بینی ؟!

**خزمەتکارەکە :** ( بە دەنگێکی نزم ) سەیرە !! ئـەو حەجیجاجەی هەزارەهای ترساندووە ئەمڕۆ لـە تارمایی ئەترسێ !

**حەجاج :** ( کوێی لێ بوو ) گێژە تارمایی نیـیە ، ئەوە •• سەعیدە بـە پاو پێستیەوە •• ئەوە و سوورە لە سەر کوشتنم •

**خزمەتکارەکە :** ( بە گاڵتەکردنەوە ) جا کوشتن ئەم ترسـەی بۆ چی‌یە ؟! بە هـەزارەهات کوشـتوون ، دە تۆش ئەمڕۆ بچێژە تامی ئەوەی کە دەرخواردی خەڵکت ئـەدا •

**حەجاج :** ( بـە تووڕەییەوە ) شایی و کامییم پێ دێتی هەی بێ نرخ ، مەرج بێ ئەگەر هەڵسامەوە بتکەمە پـەندی زەمانـە •

**خزمەتکارەکە :** لـە سەرەمەرگیشا هـەر زۆرداریی

ئەکەیت ؟! ساتێ بەر لە مەرگت خۆت بە بچووك بگرە لە بەر خوا .. بەڵام دوورە ، خوای گەورە راستی فەرمووە کە ئەگەر خراپکاران بگەڕێنەوە بۆ ژیان لە سەر کردەوەی خراپی خۆیان بەردەوام ئەبن و درۆزنن کە ئەڵێن خۆمان چاك ئەکەین وەك لە قورئانا ئەفەرموێ :

وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٢٨﴾ الأنعام

( حەججاج بە سەر قەرەوێڵەکەیەوە ئەکەوێتە خوارەوە ) .

حەججاج : ئاه .. چیم بوو بە سەر سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ؟! چیم بوو بە سەر سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ؟! ( ترس و لەزرەکەی زیاتر ئەبێت ، ئینجا هەناسەیەکی قووڵ هەڵئەکێشێت و گیانی دەر ئەچێت ).

( ئا لەم کاتەدا دەنگێك ئەبیسترێ بێ ئەوەی خاوەنەکەی دیار بێ ).

وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِى رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ إبراهيم

صدق الله العظيم[١]

( پــەردە )

کـــۆتایی

---

(١) بەڵێ تروسکەی حەجحاجیش کوژایەوە ·· دەست و پێوەند و خزمەتکارەکانی نــەیانتوانی بگــەنە فریای ·· هەر بەم شێوەیەش هەموو حەجحاجێك تیا ئەچێ و شوێنکەوتووەکانیشیان تەفر و توونا ئەبن و ناوی ستەمکاریی و خراپویستییان لــە جیهانا بۆ بە جێ ئەمێنێ ، ئیتر با لێپرسینەوە و تۆڵەی قیامەتیان بووەستێ ·

# لەکۆتاییدا

ئەمە تەنها نموونەیەکە لە مێژووی دوور و درێژی ئاینی پیرۆزی خوادا .. هەزارەها دۆست بە خوا بەم شێوەیەی سەعید بەوپەڕی بەختیارییەوە سەر ئەنێنەوە... بە خوێنی گەشیان درەختی رزگاریی خوازی ئیسلام ئاو ئەدەن .. شەهید ئەبن .. لاشەکەیان شاهێدیی ئەدا .. خوێنە گەشە بە ناڕەوا رژاوەکەیان شاهێدیی ئەدا .. ئەوزەوییەی کە بەسەریا ئەڕژێ شاهێدیی ئەدا .. ئەوانەی ئاگایان لێیە و ئاگادار ئەکرێن شاهێدیی ئەدەن .. دۆست و دوژمن شاهێدیی ئەدەن .. فریشتەکانی ئاسمان شاهێدیی ئەدەن کەوا موسڵمانان خاوەنی بیرو باوەڕێکی وەها بێ گەردن ، بە درێژایی مێژوو نایەڵن لە پێناویا خوێنیان وشک بێتەوە .. هەمیشە و هەردەم گەنجی خوێن گەرم ئەبنە قوربانی و بەو جوامێریی و قارەمانییە رێگا بۆ مرۆڤایەتیی تەخت ئەکەن تا بکەوێتە سەر راستە شەقام و نەفامیی و نەفامان

چاك بناسێ و هێز و وزەی یەكلایی بكاتەوە و بیخاتە كار بۆ دەست كۆتاكردنیان وە سەرزەویی بە پێی فەرمانی خوای گەورە و بەدەسەڵات ئاوەدان بكاتەوە •

سا خوای گەورە بە یارمەتیی و میهرەبانیی خۆی دەستی كۆمەڵی ئیماندار بگرێ لە سەرانسەری سەرزەوییدا تا بە ئەركی پیرۆزی سوود بەخشی رزگاریی‌خوازی سەرشانی خۆی هەڵسێ و مرۆڤایەتیی رزگار بكات و ئێمەیش بە یەكێ لە سەربازانی بگێرێت•

**وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين**

# وانەی شەهیدیی

دەری ئەخات مێژووی ئیسلام پڕیەتی لە ماموستا، لە پالەوان ، لە شەهیدی قارەمان ؛ کەوا بە بیری تیژیان ، بە هێزی بازوویان ، بە خوێنی گەشیان ئەمامی ئیسلامیان پێ گەیاندووە و پاراستووە و دێراوە.. ئەمەیش وانەیەکە بۆ هەڵگرانی قورئان و بزانن راستیی وا بە دەستیانەوە و ئیتر با هیچ هێزێکی نەفامیی نەتوانێ کۆڵیان پێ بدات ..

نرخی (٤٥٠) فلسە

مطبعة الارشاد ـ بغداد ـ شارع المتنبي ـ هاتف ٤١٦٧٦١٧